




# پرشنگی رۆژی کوردەواری لە شەرحی بوخاری

بەرگی سێیەم

دانەر
مەلا حسین شیخ سعدی

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ

پاریزەر
بشیر حسین سعدی

# پڕشنگی ڕوژی کوردەواری
# لە شەرحی بوخاری

## بەرگی سێیەم

دانەر
مەلا حسین شیخ سعدی

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ
پاریزەر
بشیر حسین سعدی

لەساڵی ١٩٥٢ دانراوە



وێنەی دانەر
ملا حسین شێخ سەعدی
١٨٨٣ - ١٩٨٣

# تێبینی

لەسەر داواکردنی بەشێکی زۆر لە خوێندەوارانی بەڕێز ئەوا لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئەم بەرگی سێیەمەی پرشنگی ڕۆژی کوردەواری لەشەرحی بوخاری پێشەکی بەرگی یەکەم و مێژووی ژیانی دانەر دووبارە لەم بەرگەدا بڵاودەکەینەوە بەگوڕینێکی کەمەوە هیواداریین مایەی سوود لێ وەرگرتن بێ.

لەگەڵ سوپاس

بلاوکەرەوە

پاریزەر: بشیر حسین سعدی

١٩٩٤/٤/١٩

# پێشەکی

ئەوا لێرەدا شاکارێکی تری زانای گەورەی خوالێ خۆشبوو مەلا حسین شیخ سعدی ـ تان پێشکەش دەکەین هیوادارین جێی رەزامەندی ئێوەی بەرێز بێ.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٩ کەوتە سەربیری ئەوەی ئەم پەرتووکە دابنێ کە چۆن مەعنای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بەهەرسی ٣٠ جزئی‌یەوە لە ساڵی ١٩٢٠ تەواو کرد لەتەفسیری ژیانی ئینسان.

هەر بەم شێوەیە ویستی فەرموودەکانی سەروەری گەورەمان محمد (د) وەربگێرێتە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی لایەکی تری ئایینی ئیسلام کە فەرموودەکانی پێغەمبەری گەورەمان (محمد)ە رون بکاتەوە.

ئەوەی بەردەستتان بەرگی سێیەمی تەرجەمەی بوخاری پیرۆزە. ژمارەی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر کەلەو پەرتووکەدا وەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی ژمارەیان [١٤٣٥] هەزارو چوار سەدو سێو پێنج حەدیثە.

ئەم بەرگی یەکەمەیان (٢٠٠) دووسەد حەدیثە بەگوێرەی ئەم دابەش کردنە ئەم پەرتووکە دەبێتە حەوت بەرگ.

## کۆکردنەوەی حەدیث

لەکاتی ژیانی پێغەمبەری خۆشەویست (محمد). د. رێی نەداوە کە فەرموودەکانی بنووسرێتەوە ئەوەکوو لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز تێکەڵ ببێ و لە ئەنجامی ئەم نووسینەوەدا تووشی گیروگرفت ببن لە لەبەر کردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.

## نووسینەوەی حەدیث

بەلام پاش ئەوەی کە قورئان.

نووسرایەوەو تەدوین کرا لە زەمانی ئیمامی عثمانی کوری عەففان سەلامی خوای لێ بێ ترس لەوە نەما کە فەرموودەکانی پێغەمبەر تێکەڵ بە قورئان ببێ.

ئەوە لەلایەک.

لەلایەکی تریش پاش ئەوەی کە ئایینی ئیسلام بە وولاتی عیراق و ئێران و شام و مصر بلاوبۆوە. پێویستی‌یەکانی شەریعەتی ئیسلامی زۆر فروان بوو بۆیە، بریاریان دا کە لەهەموو و لایەک فەرموودەکانی پێغەمبەر کۆبکرێنەوە بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەی دووەم بۆ شەریعەتی ئیسلام لە پاش قورئانی پیرۆز.

لەو مەیـدانـەدا چەند کەسانێك ناویان دەرکردو ئەو حەدیثانەی ئەوان کۆیان کردەوە بە ڕاست ناسران کە پەرتووکەکانیان بە ڕاست دەناسران. وەکوو [صەحیحی بوخاری] وە [صەحیحی موسلم].

وە بۆ ڕوون کردنـەوەی ژیانی ئەم زانا گەورانەی بوونە بەردی بناغەی زانیاری (عیلمی حەدیث) لە ئایینی ئیسـلام و بۆ شایی‌یـەکی یەکجـار گەورەشیـان لە شەریعەتی ئیسلام پڕ کردەوە. بۆیە لە خوارەوەو باسی ژیانی هەندێکیان دەکەین.

# ١. بوخاری

ئەم زانـا گەورەیـە ناوی محمـد کوڕی اسماعیل کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرەی جوعفی ـ بوخاری ـ ناوی دەرکردووە.

چونکە موغیرە بابی باپیری ئەم زاتە بووە.

ئاگر پەرست بووە لەسەر دەستی یەمانی بوخاری موسوڵمان بووە، کە بە جوعفی ناسرابوو.

ئەو جوعفی‌یە باوکی عەشیرەتێك بووە لەیەمەن. لە ڕۆژی هەینی لە ١٣ شوال ١٩٤هـ.

لەدایـك بووەوە لە شەوی جەژنی ڕەمـەزان مردووە لە ساڵی ٢٥٦هـ. تەمـەنی شەست و دوو ساڵ ـ سێزدە ـ ڕۆژ کەم بووە. چە کوڕی لە پاشی بەجێ نەماوە.

لە پێناوی زانین و حەدیث کۆکردنەوە ژیانی خۆی بەخت کردووە حەدیثی زۆری وەرگرتووە لە خواڵی خوشبوان.

١ـ مەکر کوڕی ابراهیم البلخی و ٢ـ ابي نعیم الفضل ٣ـ احمد ابن حنبل ٤ـ یحیا ابن معین

وەخەڵکەکی زۆریش فەرموودەکانی پێغەمبەریان، لە محمدی بوخاری وەرگرتووە.

ئەم زانـا گەورەیـە بۆ کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر نەوەد هەزار کەسی دیتووەو حەدیثی لێ وەرگرتوونە.

هەر بۆ ئەم مەبەستە ـ محمدی بوخاری ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ:ـ

ئەم پەرتووکەی (صەحیحی بوخاری) لە ناو ـ شەش سەد هەزار حەدیث دەرم هێنـاوە. وە هەر حەدیثەکەم نووسیبێتەوە دووڕکعەت نوێژم کردووە سوپاسی خوام کردووە کەسەر کەوتم بۆ ئەو کارە گەورەیە.

بۆیە پەرتووکەکەی ئەویش ناسراوە بە بوخاری ـ یان صەحیحی بوخاری.

## ٢. مسلم

دووەم کەس لەوانەی کە فەرموودەی پێغەمبەریان کۆکردیتەوەو پەرتووکەکەی بە راست ناوی دەرکـردووە ـ (صـەحیحی موسلیمە)ە ناوی ئەم پیاوە گەورەیە: ابو الحسين مسلم ابن الحجاج ابن مسلم القشيری النيسابوريه لە سالی (٢٠٤) کۆچی لە دایك بووە وە لە سالی (٢٦١) کۆچی لە مانگی رەجەب مردووە. لە تەمەنی پەنجاو حەوت سالی.

لە پێنـاوی زانیاری حەدیث کۆکردنەوە زۆر جێ گەراوە. وە زۆر فەرموودەکانی پێغەمبەری لەم بە ریزانە وەرگرتووە.

١ـ يحيا ابن يحيا ٢ـ قتيبه ابن سعيد ٣ـ اسحاق ابن راهويه ٤ـ احمد ابن حنبل وە زۆرانی دیکەش.

وە دەفەرمووی پەرتووکی [المسند] م لە سێ سەد هەزار حەدیث پێك هێناوە کەلەم سێ سەد هەزار حەدیثە ئەوە ندەم زۆر بە راست زانی و نووسیمەوە.

و (خطيب)ی بەغدادی دەفەرمووێ ئیمامی مسلم ـ لە دوو بوخاری رۆیشتووە لە شێوەی حەدیث کۆ کردنەوە و هەر لە دوو ئەو چووە.

## ٣. أبو داود

ناوی سليمان ابن الاشعث ابن اسحاق الاسدي سەجستانی ـ بووە.

لە پێناوی زانین و حەدیث کۆکردنەوە زۆر گەراوە. زۆر شتی لەسەر خ‍ـ‌ڵکی عیراق و شام و مصر و خوراسان نووسیوە لە سالی (٢٠٢) کۆچی لە دایك بووە وە لە ٢٠ شوال سالی ٢٧٥ کۆچی. کۆچی دوایی کردووە.

وە حەدیثی وەرگرتووە لەمەشایخی گەورە وەکوو بوخاری و مسلم و احمد ابن حەنبەل.

وە (عثمان ابن ابي شيبه) وە قوتەیبە ابن سعيد.

وە زۆر کەسیش حەدیثی لە ئەو وەرگرتووە وەکوو ١ـ ابو عبدالرحمن النسائي ٢ـ ئەبوو علي اللؤلؤی. وە زۆرانی دیکەش.

پەرتـووکی (السنن)ی دانـاوە پیشانی امامی احمد ابن حەنبەلی داوە ئەویش زۆری رالێ بووە و پەسندی کردووە. (ابو داود) رەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرمووێ (٥٠٠٬٠٠٠) پێنج سەد هەزار حەدیثی پێغەمبەرم کۆکردەوە تەنیا [٤٨٠٠] چوار هەزار و هەشت سەد حەدیثی لە پەرتووکەکەی خۆیدا نووسییووە.

وەدەفەرموێ بۆ پاراستنی ئایینی هەر موسولمانێك ئەم چوار حەدیثە بەسە.

١ـ الاعمال بالنيات.

٢ـ من حسن اسلام المرء تركه ما لا يعنيه.

٣ـ لا يكون المؤمن مؤمنا حتى يرضى لاخيه ما يرضى لنفسه.

٤ـ الحلال بين والحرام بين.

ئەبوو داود لە پلە بەرزەکانی زانین بووە (خطابی) گوتوویە لە زانینی ئایینی ئیسلامی پەرتووك دانەنراوە وەکوو پەرتووکی [السنن] لابی داود.

ئەبوو داوود فەرموویەتی ـ لەم پەرتووکەی خۆما هیچ حەدیثەکم نەنووسیتەوە ئەگەر خەڵکی بڕیاری ناڕاستیان لەسەر دابێ.

## ٤ـ الترمزی

ناوی (ابو عیسی محمد ابن عیسی) ناسراوە بە ـ (الترمذی) لە ساڵی (٢٠٠)ك لەشەوی دووشەم ١٣ رجب، ساڵی ٢٧٩ كۆچی.

لە دایك بووە. یەکێك بووە لەو زانایانەی کە فەرموودەی پێغەمبەری لەبەر بووە.

یەکێك بووە وەکوو [قوتەیبە ابن سعید].

وە [محمد ابن بشار] وابن الحجر العسقلانی. وە خەڵکەکی زۆر یش حەدیثی لە ئەو وەرگرتووە.

پەرتووکەکی داناوە لە حەدیث بەناوی [الصحيح]. دەفەرموێ ئەم پەرتووکەم پیشانی زاناکانی وولاتی حیجازو خۆراسان داوە پەسندیان کردووەوە گوتراوە هەرچی ئەم پەرتووکەی لەماڵ دا بێ هەر وەکوو پێغەمبەری گەورەمان محمد ـ لە ماڵیا بێ ئەو هایە.

## ٥ـ النسائی:

ناوی ابو عبد الله احمد ابن شوعەیب ابن علی ابن بەحر ـ لە ساڵی ٢١٥ كۆچی لە دایك بووە.

وە لەشاری مەککە كۆچی دوایی کرد لە ساڵی (٣٠٣) كۆچی.

یەکێك بووە لە زاناکانی حەدیث. وە زۆر حەدیثی لە قوتەیبە کوڕی سعید وەرگرتووە.

وە لە علی کوڕی حشرم واسحاقی کوڕی ابراهیم وە لە محمد ابن بشار وە ئەبی داود السجستانی. وە لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعی بووە. وە علی کوڕی عمر الحافظ لەسەر نسائی بەم شێوەیە دەدوێ ـ ابو عبدالرحمن النسائی ـ لە پێش

هەمـوو ئەو کەسـانـەیە کە لەزمانی خۆی ژیاوە وە زۆر لە وانەی فەرموودەکانی پێغەمبەریان لە بەر بووە ئەویان پەسند کردووە وەکوو عبد الله ابن احمد وە احمد ابن حنبل.

وە خاوەنی پەرتووکی [المجتبى] یە لە حەدیث.

هیچ حەدیثی تیدانی یە کەبە تەواوی ڕاست نەبێ.

## ٦. (أبن ماجة):

ناوی ابـو عبـد الله محمد کوری یزید کوری (ماجە) ی قەزوینییە. لە سالی (٢٠٧) کۆچی لە دایك بووە. یەکێك بووە لە زانا گەورەکانی حەدیث.

وە یەکێك بووە لەشەش امامەکانی حەدیث. یەکەم کەس کە (ابن ماجە)ی خستە سەر پێنج ئیمامەکەی دیکە ابو الفضل کوری طاهر بووە.

وە لە سـالی (٢٧٥ك) کۆچی دوایی کردووە لە ڕۆژی سێ شەم.

ئەم شەش پەرتووکەی باسمان کرد لەگەل دانەرەکانیان ناسراوون بە (کتب السنة).

وە ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر کە لەم پەرتووکە دایە لەم شەش کتیبە راستەی باسکراودا هەیـە هیـچ گومـان لە ڕاستیـیان نییەو هیوادارین بۆ خوێندەواری خۆشەویستی کوردمایەی سەەد لێ وەرگرتن بێ بۆ کاروباری دین و دونیا.

(بلاو کەرەوە)
بشير حسين سعدي
١٩٩٤/٤/١٩

بۆ نووسینی ئەم پێنەکی بە سوودە لەم سەرچاوانە وەرگرت
١ـ کتاب تيسير الوصول الى جامع الاصول / من حديث الرسول للعلامة عبد الرحمن ابن علي المعروف بالشيباني. جـ١
٢ـ سبل السلام في بلوغ المرام في جمع أدلة الاحكام للعلامة محمد ابن اسماعيل الصنعاني.

# مێژووی ژیانی دانەر

دانەری ئەم پەرتووکە پیرۆزە وەرگێڕی فەرموودەکانی پێغەمبەری گەورەمان محمد دروودی خوای لەسەر بێ - لە پەرتووکی بوخاری.

زانای گەورە خوالی خۆشبوو - مەلا حسین شیخ سعدی - یە. لە سالی ١٨٨٣ زاینی لە شاری هەولێر لە گەڕەکی خانەقا هاتۆتە دونیاوە. وە بەرەچەلەك لە عەشیرەتی بلباسە وەلەلای زۆر زانای گەورەی زەمانی خۆی خوێندوویەتی وەکوو مەلا عبد اللەی جەلی زادە لە کۆیەو لە گوندی سکتان لایمەلا احمدی خەلیفە - ولە هەولێر لای مەلا ابو بکر عمر افندی وە هەرلای ئەم زاتەش اجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. لە سالی ١٩١٣ لە گوندی قەپلان دامەزراوە بەمەلا - وەلە زۆر گوندی تریش مەلایەتی کردووە وەکوو سیاوو خورمەلەو ماستاوەو سوریژەو دوو گردکان لە دەشتی هەولێر. وە لە سالی ١٩٤٧ لە دوو گردکان هاتە هەولێر وە بووە ئیمامی مزگەوت.

وە لەسالی ١٩٧١ خانەنشین کرا. هەر بە خوێندنەوەی پەرتووکی ئاینی و قورئان خوێندن خەریك بووە تالەبەیانی رۆژی یەکشەمە لە ١١-١٢-١٩٨٣ لە سەعات دەی بەیانی کۆچی دوایی کرد.

وە لە گۆرستانی - چراغ - لە هەولێر نێژراوە.

## دانراوەکانی

١-ژیانی ئینسان تەفسیری قورئان دەکەوێتە شەش بەرگ هەمووی چاپ کراوە.

٢ - پرشنگی رۆژی کوردەواری لە فەرموودەکانی پێغەمبەر لە پەرتووکی بوخاری - کە وەرگێرانی ١٤٣٥ فەرمووەدەی پێغەمبەرە بۆ سەر زمانی کوردی ئەویش دەکەوێتە حەوت بەرگ.

٣ - جامع الصغیر - دەکەوێتە دوو بەرگ ئەویش وەرگێرانی فەرموودەی پێغەمبەرە بۆ سەر زمانی کوردی.

٤ - دیوانی هەلبەستی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی. بەلام بەشی زۆری بزر بووە. ئەویش لە هەولێر لە چاپخانەی رۆشنبیری چاپ کرا لە سالی ١٩٨٤.

٥ - وەرگێرانی قەصیدەی بوردیە لە عەرەبیەوە بۆ کوردی بە هەمان کێش و

قالیه له دانانی شیخ محمدی بووصیری‌یه ئەم پەرتووکەش له سالی ١٩٨٥ له چاپخانەی رۆشنبیری چاپ کرا له هەولێر.
٦ ـ شەرحی چوارینەکانی خەیام به عەرەبی به ناوی (حقائق الخیام).
٧ ـ وەرگێرانی قەسیدەی توحیدیەی فریدالدین عەطار له فارسی‌یەوه بۆ عەرەبی.
٨ ـ وەرگێرانی لەمەعات فخرالدین عراقي ـ له فارسی‌یەوه بۆ عەرەبی.
٩ ـ شەرحی ذات الشفا به کوردی.
١٠ ـ پەرتـووکی (العقـود) به عەرەبی که بریتی‌یـه ٥٨٧ بەیت هەلبەستی عەرەبی. له فقهی شافعی.
١١ ـ نەظمی تهذیب المنطق به عەرەبی.
١٢ ـ شەرحی لوائح له فارسی بۆ عەرەبی.
١٣ ـ پەرتووکی بەلاغەت به عەرەبی.
١٤ ـ منهج الحقیقة به عەرەبی.
١٥ ـ رازەکانی قورئان ـ اسرار القرآن ـ به کوردی.
١٦ ـ شەریعەتی اسلام له چوار مەزهەب به کوردی.

بلاوکەرەوه
بشیر حسین سعدی

٣٧٥ عن ابن عمر (رض) هل وَجدتم ما وَعَدَ ربكُمْ حقّاً فقيل لهَ أتدعو أمواتاً. فقال ما انتُمْ بأسمعَ منهم. ولكن لا يجيبون.

## تەرجەمە

٣٧٥ دەگێڕنەوە لە کوڕی عومەر - ڕەزای خودای لێ بی - پێغەمبەر (د) چووە سەربیری قولەیب لە بەدر کەلاکی ئەبو جەهل ی کوڕی هشام و ئومیەی کوڕی خەلەف و عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەی فڕە درا بووە ناوی دیتیشی لە ناخۆشترین عەزابدانە. فەرمووی بە قسەکردن لە گەڵیان. ئەرێ گەیشتنە ئەو جەزایەی کە خودا بەڕاست وەعدەیدا. حەزرەتی عومەر گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەرێ تۆ گازی مردوان دەکەی. پێغەمبەر (د) فەرمووی وانییە ئێوە باشتر گوێتان لەم قسانەی من بی لەوان بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە: ئەمە دەلیل و بەڵگەیە لەسەر هەبوونی ژیانی پاش بۆ سزادان.
وە هەستی هەموو ئێش و ژانەك بە هەموو حەواس (واتە هەستەکان).

٣٧٦ عن أبي أيوب (رض) يهودُ تُعذَّبُ في قبورها

## تەرجەمە

٣٧٦ دەگێڕنەوە لە ئەبوو ئەیوب (ڕەزای خودای لێبی). گوتی پێغەمبەر (د) لە پاش ڕۆژئاوا بۆ دەرەوەی مەدینە دەرکەوت گوێی لە دەنگێك بوو فەرمووی ئەمە جوولەکەن لە ناو قەبرەکانیان عەزاب دەدرێن.

٣٧٧ عن أبي هريرة (رض) اللهمَّ إنّي اعوذ بك مِن عذاب القبر وَمن عذاب الّنار وَمنْ فتنة المحيا والمات وَمِن فتنَةِ المسيح الدَّجال

## تەرجەمە

٣٧٧ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە - (ڕەزای خودای لێبێ) پێغەمبەر (د) ئەم دوعایەی دەکرد دەی گوت ئەی خودایا بەڕاستی من خۆم دەپارێزم بەتۆ لە عەزابی قەبرو لە عەزابی ئاگر.
وە لەدەردو بەلایانی ژیان و ناخۆشییەکانی پرسیاری منکرو نەکیر لە جوابدانە ومیان نەشێویم وەلە امتحان و بەلای مەسیحی دەجال.

(ش): لەم حەدیثانەی باس کراو سؤالی منکرو نەکیرو عەزابی قەبر ثبوتی بوو: بۆ شەهیدی شەری کافران نەبێ: وە بۆ ئەوکەسە نەبێ کە مردبێ بە طاعون ووەبا: یاخۆ هەموو شەوێك سورەی مولکی خوێندبێ لە پاش هەموو نوێژی (مەغریب): یاخۆ مرابط بێ لەسەر سنووری وولاتی ئیسلام.

٣٧٨ عن ابن عمر (رض) انَّ أحدَكم اذا ماتَ عُرِضَ عليه مقعَدُهُ بالغداةِ والعَشِي ان كانَ مِن أهـل الجنةِ فمن اهل الجنةِ وان كان من اهل النار. فمَن أهل النار فَيقالُ هذا مقعدُكَ حتىٰ يبعَثكَ الله الىٰ القيامةِ.

## تەرجەمە

٣٧٨ دەگـێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێبێ. بەڕاستی پێغەمبەری خودا فەرمووی. یەکێك لە ئێوە وەکوو مرد هەموو سبەینێو ئێوارە جێگای خۆی نیشـان دەدرێ. ئەگەر مردووەکە بەهەشتی بێ ئەوا جێگایەکەی بەهەشتی نیشان دەدرێ و بەهەشتییە وە ئەگەر لە ئەهلی ئاگریش بێ ئەوا جێگایەکەی ناو ئاگری نیشان دەدرێ و لە ئەهلی ئاگرە.
پێشی دەگـوترێ لە لایەن مەلائکەوە ئەمە جێگای تۆیە ڕۆژی قیامەت کەبۆ ئەم جێگایەت زیندوو دەکاتەوە خودای گەورە.

٣٧٩ عن ألبراء (رض) انَّ له مرضعاً في الجنةِ.

## تەرجەمە

٣٧٩ دەگێڕنەوە لە (بەراء) ڕەزای خودای لێبی گوتی وەکوو کوڕی بچووکی پێغەمبەر ابراهیم لە بەر مەمك بوو وەفاتی کرد. فەرمووی ئافرەتی شیردەری هەیە لە بەهەشت.
(ش): عەینی ئەم حەدیثە لە مەسندی فریابی دەرحەق بە خەدیجەی گەورە هەیە بەم تەرزە لە پاش مردنی قاسمی کوڕی پێغەمبەر (د) پێغەمبەر بە خۆی چووە لای خەدیجە.
خەدیجـە گوتی قاسمی کوڕم ئەگەر ئەمردایە هەتا لەشیر دەبووە ئەمەندە غەمناك نەدەبـووم پێغەمبەر فەرمووی شیردەری هەیە لە بەهەشت. خەدیجە گوتی ئەگەر بزانم وایـە ئەمـەندە غەمناك نابم. پێغەمبەر فەرمووی ئەگەر حەزدەکەی وا دەکەم گوێت لە دەنگی قاسمی کوڕت بێی لە بەهـەشت. خەدیجـە لەبـەر ئەمە کەئەوەك

ئیمـانەکەی ببێتە عەیانی‌و پاداشتی باوەڕی غەیبی نەبێ. گوتی من باوەڕ دەکەم بەخوداو پێغەمبەری خودا. سوهەیلی گوتی ئەم فکرەی خەدیجەی لەبەر زێدە زانینی بوو (چونکی لە باوەڕی غەیبی ئەجرو ثەواب هەیە).

۳۸۰ عَنْ ابنِ عباس (رض) الله اذخلقهم أعلَمُ بما کانوا عاملین.).

## تەرجەمە

۳۸۰ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس ـ ڕەزای خودای لێبێ. دەرحەق بە ئەولادی مشرکان پرسیار کرا لە پێغەمبەر (د) فەرمووی خودا وەکوو ئەوانی دروست کرد زانابوو بە کردەوەی ئەوان.

(ش)

(واتە ئێستا هیچ کردەوەیەکی وایان نییە. لەبەر ئەو عەزاب بدرێن. چونکی موکەلەف نین. وە ئەگەر موکەلەفیش بوونایە ممکن بوو باوەڕیان بهێنابایە.

ئەم حەدیثە وا دەگەیەنێ کە کاری ئەوان ڕاوەستاوە. واتە کاری مندالی کافران لەویستی خودا دایە. عەزاب دان و بردنە بەهەشتیان خودا دەیزانێ (وەرگێڕ): دەرحەق بەمندالی کافران زۆر ڕای جودا هەیە بەلام لای ئیمامەکانی شافعی‌و ئیمامی ئەوەوی چوونە بە هەشتیان (ترجیح)و پەسندکردووە بۆ ئەوان.

۳۸۱ عن سمرَةَ ابن جندُب (رض) قال النبيُّ صلی‌الله تعالیٰ علیه وسلم. من رأی منکم اللیلةَ رؤیاً.

## تەرجەمە

۳۸۱ دەگێڕنەوە لەسومرەی کوڕی جوندوب گوتی پێغەمبەر (د) وەکوو نوێژی سبەینەی بکردایە ڕووی لە ئێمە دەکرد دەی فەرموو کامەتان ئێمشەو خەونەکی دیوە ئنجا ئەگەر یەکێك خەونی بدیتبایە بۆی دەگێڕاوە.

یەك. ڕۆژ گوتی ئەری کامەتان خەونێکتان دیوە گوتمان کەس نەی دیوە فەرمووی من خەوێکم دیوە ئەمشەو.

۳۸۲ قال صلی الله تعالیٰ علیه وسلم لکنيّ رأیتُ اللیلةَ رَجُلین آتیاني فأخذا بیدي فأخرَجاني الی الارض المقدَّسَة فاذا رَجُلٌ جالسٌ و رَجُلٌ قائمٌ بیدهِ کَلُّوبٌ من حدیدٍ یدْخِلُهُ في شدقِهِ حتی یبلُغَ قفاهُ ثم یفعَلُ بشدْقهِ الاخر مثل ذلكَ یلتئم شِدقُهُ هذا

فيعودُ فيصنعُ مِثلَهُ قلتَ ماهذا. قالا انطلقْ حتى اتينا على رُجلٍ مضطجعٍ على قفاه ورجـل قائمٌ على رأسه بفهرٍ أو صخرة فيشْدَخُ به رأسَهُ فاذا ضربه. تدهده الحجرُ فانطلقَ اليه ليأخذَهُ فلايرجعُ الى هذا حتى يلتئم رَأْسُهُ وعادَ رأْسُهُ كما هو فعادَ اليهِ فضربه. قُلْتُ مَن هذا. قالا انطلق فانطلقنا الى ثَقْبٍ مثل التنّور أعلاه ضيقٌ وأسفله واسعٌ يتوقَّدُ تحته ناراً فاذا أقترب ارتفعوا حتى كادَ أن يخرُجوا فأذا خمدَت رجعوا فيها وفيها رجالٌ ونسـاءٌ عُراةٌ فقلتُ من هذا قالا انطلق فانطلقنا حتى أتينا على نهرٍ مِنْ دم فيه رجُلٌ قائمٌ وعلى وسط النهر رجُلٌ بين يديْه حجارةٌ فاقبل الرَّجُلُ الذي في النهرِ فاذا اراد انْ يخرُجَ رمى الرُجلَ بحجرٍ في فيهِ. فردَّهُ حيثُ كانَ فجعَلَ كلَّما جاءَ ليَخرُجَ رمى في فيهِ بحجرٍ فيرجعُ كما كان فقلْتُ ماهذا قالا انطلق فانطلقنا حتى إنتهَيْنا الى روضـةٍ خضراءَ فيهـا شجرةٌ عظيمةٌ وفي اصلها شيخٌ وصبيانٌ واذا رجُلٌ قريبٌ من الشجرةِ بينَ يدَيْهِ نارٌ يوقدها فصعدا بي في الشجرةِ وآدخلاني داراً لم ارَ قطُّ آحسَنَ منهـا فيها رجالٌ شيوخٌ وشبابٌ ونسـاءٌ وصبيانٌ ثمّ اخرَجاني منها فصَعدابي الشجرةَ وأدخلاني داراً هيَ أحسنُ وافضلُ فيها شيوخٌ وشبابٌ فقلْتُ طوّفتُماني اللّيلةَ فاخبراني عمّا رأيتُ قالا نعم امّا الذي رأيتَهُ يُشقُّ شِدْقُهُ يومَ القيامةِ فكذّاب يحدّثُ بالكذبةِ فتحملُ عنه حتى تبلغ الآفاق فيصنع به الى يوم القيامةِ والذي رأيتَهُ يشدخُ راسهُ فرجُلٌ علّمهُ الله القرآنَ فنامَ عنه بالليل ولم يعملْ فيه بالنهارِ ويُفعَلُ به الى يوم القيامَةِ. والذي رأيتَهُ في الثُقبِ فهمُ الزُناةُ والذي رأيتَهُ في النهرِ آكِلوا الرِّبا. والشيخُ في اصل الشجرةِ ابراهيم عليه السـلام والصبيانُ حولَهُ فاولاد الناسِ والذي يوقدُ النارَ مالكٌ خازنُ النارِ والدار الاولى التي دخلْتَ دارُ عامَّةِ المؤمنينَ وامّا هذه الدار فدار الشهداء وانا جبريلُ وهذا ميكائيل فارفَعْ رأسكَ فرفعتُ رأسي فاذا فوقي مثلُ السحاب. قالا ذاكَ منزلك. قلتُ دعاني أدخلْ منزلي. قالا انه بقيَ لك عمرٌ لم تستكملْهُ فلوا استكملتَ اتيتَ منزلَكَ.

## (تـهرجـهمـه)ى
## قسهو خهونى پيغهمبهر

٣٨٢ پيغـهمبـهر فهرمـووى (د). من ئيمشـهو له خهو دوو پياو هاتنه لام. دهستىيان گرتم منيان برده دهرى بو عهردى پيروز (مقدس) لهناكاو ديتم پياويك دانيشتبوو. پياويكيش راوهستابوو قولابهيهكى له ئاسنى بهدهستهوه بوو قولابهكهى لهلا لغاوهى پياوهكهى دانيشتوو رادهكرد ههلى دهدراند ههتا لاى پشتهوهى. پاشان قولابهكهى دهخسته لالغاوهكهى ترى.

ئەویشی هەڵدەزراند هەتا پشتەوەی. ئنجا لە پاش چاك بوونەوەی لا لغاوەی پێشانی دووبارە قولابەی لەناو رادەكردەوە هەڵی دەزراندەوە ئیتر كارو پیشەی هەر دراندنی لا لغاوەی بوو لە پاش چاكبوونەوەی. گوتم ئەوە چی‌یە گوتیان برۆ - ئێمەش رۆیشتین هەتا هاتینە سەر پیاوێك. لەسەر پشت پاڵ كەوتبوو پیاوێكیش راوەستابوو لەسەر سەری. بەردێكی پڕ بە كۆڵی بەدەستەوە بوو سەركی پاڵ كەوتووەكەی پێ دەشكاند. وەی لێی دەدا بەردەكە وەردەگەڕا لەدەستی دەچووە دەرێ پاشان دەچوو بەردەكە بینێتەوە ئەدەگەڕاوە لای پاڵ كەوتووەكە كەسەرەكەی چاك دەبۆوە وەكوو جاران دووبارە راوەستاوە كە دەگەڕاوە سەری بەبەردەكە سەرەكەی دەشكاند گوتم ئەمە كێ‌یە گوتیان برۆ ئێمەش رۆیشتین هەتا گەیشتینە كونێك. وەكوو تەندوور سەری تەسك بوو بنی فرەوان بوو ئاگری لەبن دەسووتا وەكوو نزیك دەبوو بسووتێ و جۆش بخوا عالەمەكە بۆ سەرەوەی دەهاتن هەتا نزیك بوو بێنەدەرێ وەكوو ئاگرەكەش كز دەبۆوە دەگەڕانەوە ناوی چەند پیاوو چەند ژنی رووت لەو كونە هەبوو. گوتم ئەمە چی‌یە گوتیان برۆ رۆیشتین هەتا هاتینە سەر رووبارێك لە خوێن لەنێو رووبارەكە پیاوێك راوەستابوو. لەسەركەناری رووبارەكەش پیاوێك چەند بەردێكی لە پێش بوو پیاوەكەی ناو رووبار. وەكوو بیویستبایە بێتە دەرێ. ئەو پیاوی بەردیشی لە پێش بوو بەردێكی لەناو دەمی دەدا. دەی گێراوە جێگای خۆی لەناو رووبار. گوتم ئەمە چی‌یە گوتیان برۆ ئێمەش رۆیشتین هەتا گەیشتینە مێرگەكی سەوز دارێكی گەورەی تێدابوو. لەبن دارەكەش پیاوێكی ئیختیار هەبوو. چەند منداڵیش هەبوو. لە نزیك دارەكەش پیاوێك هەبوو لە پێش خۆی ئاگری هەڵ دەكرد ئەو دوو پیاوەی منیان بەسەر دارەكەخست. داخلی خانوێكیان كردم لەم خانووە خۆشترو رازاوەترم قەت نەدیبوو. لەناو ئەم خانووە چەند پیاوو چەند اختیارو چەند نەوجەوان هەبوون. پاشان لە خانوەكە منیان هینا دەرێ بردمیانە خانوەكی تر. لە خانوەكەی پێشوو زۆر رازاوەترو بەرێزتر بوو. لەوێش چەند ئیختیارو چەند نەوجەوان هەبوو. پاشان بەدوو پیاوەكانم گوت. ئێمشەو زۆرمتان گێڕا ئنجا خەبەرم پێبدەن ئەوی من دیتم گوتیان باشە. ئەو پیاوەی دیتت بە قولابەی ئاسن لالغاوەی هەتا پشتەوەی هەڵدەزرا. درۆزنێكە. درۆی وادەكا لە هەموو لایەك درۆیەكانی دەگێڕنەوە. ئنجا بەم جۆرە عەزاب دەدرێ هەتا رۆژی قیامەت وە ئەو پیاوەی دیتت سەریان دەشكاند ئەوەش ئەو كەسەیە خودا قورئانی فێركردووە. بەشەو نای خوێنێ‌و بەرۆژ كاری پێ‌ناكا. ئنجا بەم جۆرە عەزاب دەدرێ هەتا رۆژی قیامەت وە ئەو خەڵكەی دیتت لەناوكونەكە. ئەمانەش زیناكەرەكانن. وە ئەوەی لەناو رووبارەكەش دیتت ریبا خۆرن. وە ئەو

اختیارەی لەبن دارەکەت دیت. ابراهیم پێغەمبەر بوو ـ سەلامی خوای لێبی ـ وە ئەو منداڵانەی لە دەوریشی بوون منداڵی خەڵکی بوون. وە ئەو پیاوەی دیتت ئاگری خۆش دەکرد. ئەوە مالکی خازنی ئاگربوو وە ئەو خانوەی پێشان چوویە ناوی. خانووی هەموو باوەڕداران بوو. وە ئەما ئەم خانووە خانووی شەهیدانە. وەمنیش جوبرائیلم ئەوەش میکائیلە. ئنجا سەرت بلند بکە. سەرم بلند کرد دیتم لە سەرووەم شتێك وەکوو پەڵە هەورێکی سپی دیاربوو گوتیان ئەوەش جێگاو شوێنی تۆیە. گوتم لێم گەرێن بچمە شوێنی خۆم گوتیان هێشتا تەمەنت ماوە ماوەی ژیانی خۆت تەواو نەکردووە ئەگەر تەواوت بکردایە دەچووی.

٣٨٣ عن عائشة (رض) انَ رَجُلاً قال للنبيُّ صلى الله تعالىٰ عليه وسلم انَّ امّي افْتُلِتَت نفْسُها. واظنّها لو تكلمَتْ تصَدَّقَتْ. فهل لها اجْرٌ انْ تصَدَّقْتُ عنها قالَ نَعَم.

## تەرجەمە

٣٨٣ دەگێڕنەوە لە عائشە ـ ڕەزای خودای لێبی پیاوێك بە پێغەمبەری گوت. گوتی دایکم لەناکاو مرد. لام وابوو ئەگەر زمانی بگەڕایە خێرو وەصیەتی دەکرد. ئەگەر من خەیری بۆ بکەم ئایا خێرەکەی پێ دەگا فەرمووی بەڵێ. (ش). لەم فەرموودەی پێغەمبەرە. وا دەزانرێ مردنی لە ناکاو هیچ کەراهەتێکی نییە چونکی وەکوو پیاوەکە خەبەری پێدا پێغەمبەر هیچ جۆرە ناڕەزاییەکی پیشان نەدا.

٣٨٤ عن عائشةَ (ض) قال رسول الله صلىٰالله تعالىٰ عليه وسلم آيْنَ انا اليوم. ايْنَ انا غداً.

## تەرجەمە

٣٨٤ دەگێڕنەوە لە عائشە (ڕەزای خودای لێبی).

پێغەمبەر لە نەخۆشی وەفاتی. چونکی ئارەزووی لای منی هەبوو. پارێزگاری ـ نۆبەتیشی هەردەکرد لە بەینی ئافرەتەکانی ـ بۆ خاتری ئەمە کە بزانی کەی نۆبەتی من دێ فەرمووی ئیمرۆ نۆبەتی کێیە لە خێزانەکانم. سبەی نۆبەتی کامەیانە. ئنجا خودا وای کرد لە نۆبەتی من لەلای من وەفاتی کرد وە لە خانووی منیش نێژرا.

٣٨٥ عن عائشة: لاتسبّوا الاموات فانّهم قد أفضوا الى ماقدّموا.

## تەرجەمە

٣٨٥ دەگێرنەوە لە حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لێبێ. پێغەمبەر فەرمووی جنێو بە مردووان مەدەن چونکی ئەوان گەیشتن بە هەرچی کەلە پێش خۆیان رەوانەکرد.
(لەخێرو شەر ئنجا هەرکەس بە کردەوەی خۆی جەزا دەدرێ.

# كتاب الزكاة
# باسی زەکات

٣٨٦ عن ابن عباس (رض) أدعهم الى شهادةِ ان لااله الآ الله وانى رسول الله فان هم آطاعوا لذ لِكَ فاعلِمْهُم انّ الله افترَضَ عليهم خمسَ صلواتٍ في كلِ يومٍ وليلةٍ فان هم اطاعوا لذلِكَ فاعلمهم انّ الله افترَضَ عليهم صَدَقَةً في اموالهم تؤخَذُ من أغنيائهم وترَدُّ على فقراءِهم.

## تەرجەمە

٣٨٦ دەگێرنەوە لە کوری عەباس ـ رەزای خودای لێبێ. پێغەمبەر (د) لەسالی دەیەمی هیجری لە پێش حجة الوداع مەعاذی نارد بۆ ئەهلی یەمەن کە تەعلیمی قورئان و شەریعەتی ئیسلامیان بکا. حوکمیشیان لە بەیندا بکا. زەکاتیش لە خەڵکی وەربگری ئەوەی زەکاتی لێ دەکەوی. فەرمووی لەیەکەم جار ـ شەهادەت بێنن. کە هیچ پەرستراوێکی راست نی‌یە خودا نەبێ. وەبەراستی منیش پێغەمبەری خودام. ئنجا ئەگەر لەم شەهادەت هێنانە.
گوێ رایەڵیان کرد. ئاگاداریان بکە بێشك خودا پێنج نوێژی لەسەر ئەوان فەرزکردوە لەشەوو رۆژێکدا. ئنجا ئەگەر لەمەش گوێ رایەڵ بوون ئاگاداریان بکە کە خودا لەسەری فەرزکردونە زەکات لە ماڵی دەولەمەندان دەربکرێ بدرێتە هەژاران.

٣٨٧ عن آبِ ايوب: مالَهُ مالَهُ، آرَبٌ مالَهُ تعْبُدُ اللهَ ولا تشْرِكُ به شيئاً. وتقيم الصلاةَ وتؤتي الزكاةَ وتصِلُ الرحمَ.

## تەرجەمە

٣٨٧ دەگێڕنەوە لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) پیاوێك بە پێغەمبەری گوت ئاگادارم بکە بەکارە باشێکی وا بچمە بە هەشت. ئەوانەی لەوێ دانیشتبوون گوتیان ئەو پیاوە چی‌یەتی چی‌یەتی. یەعنی چی شتێك لە پێغەمبەر دەپرسی پێغەمبەر (د) فەرمووی. پیویستی‌یەکی زۆر گەورەی هەیە: چی‌یەتی: پێغەمبەر فەرمووی ئەوەی کە خەلکی دەباتە بە هەشت ئەوەیە خودا بپەرستی. هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەی وە پێنج فەرز نوێژ بکەی وە زەکاتی ماڵ بدەی وە چاکە دەرحەق بە خزم بکەی.

٣٨٨ عن ابي هريرة (ض) تعبدُ الله ولاَ تشرِكُ بِهِ شيئاً. وتقيم الصلوةَ المكتوبةَ. وتؤدي الزكاةَ المفروضةَ. وتصومُ رمضانَ. قال الأعرابي والذي نفسي بيده لا أزيدُ على هذا فلمّا وَلّى قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم. من سرَّهُ ان ينظر الى رجلٍ من اجل الجنةِ ـ فلينظُر الى هذ الرجلِ.

## تەرجەمە

٣٨٨ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە. پیاوێك هاتە خدمەت پێغەمبەر (د). گوتی کارێکی وام پێ بلێ بیکەم بۆ ئەوەی بچمە بە هەشت فەرمووی خودا دەپەرستی. هیچ شتێك نەکەیە هاوبەشی خودا پێنج فەرزەی نوێژ بکەی وە زەکات بدەی. وە مانگی ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو بی. پیاوەکە گوتی بە حەقی ئەو کەسەی کە ڕووحی منی بە دەستە لەوەندە زیاتر ناکەم. پێغەمبەر (د) گوتی کەسێك پێی خۆشبێ تەماشای بە هەشتی یەك بکا باتەماشای ئەم پیاوە بکا.
(ش) ئیمامی شافعی لەم حەدیثە پیرۆزە. وای دەرهێناوە کە واجب و فەرز لە نوێژ لە پێنج زیاتر نی‌یە. (ویترکەلای ئیمامی ئەعزەم واجبە بە حەدیثێکی ترە).

٣٨٩ عن عمر (ض) أُمرتَ ان أقاتل النّاسَ حتىٰ يقولوا لا اله الاّ الله فمن قالها فقد عَصمَ مِنّيَ مالهُ ونفسهُ الاّ بحَقِّهِ وحسابهُ على اللّه.

## تەرجەمە

٣٨٩ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عومەر ـ ڕەزای خودای لێبێ گوتی پێغەمبەر (د). فەرمووی لە لایەن خودا ئەمرم پێ کراوە کە کوشتاری خەلکی بکەم هەتا دەڵێن لا اله

الا الله. ئینجا ئەگەر کەسێك ئەم کلمەی تەوحیدی بەزمان ئیقرار پێ کرد ماڵ و روحی خۆی لە جەنگ من نەجات دا بە حقوقی شەرعیە نەبێ. حساب و حەقیقەتی حاڵی ئەویش عائد بە خودایە.

٣٩٠ عن ابي هريرة (رض) تأتي الا بل على صاحبها على خير ما كانت اذا هو لم يُعط فيها حقها تطأه باخفافها وتأتي الغنم على صاحبها على خير ما كانت اذا لم يعط فيها حقها تطأه باظلافها وتنطحه بقرونها ومن حقها أن تحلَبَ على الماء ولا يأتي احدكم يومَ القيامة بشاةٍ يحملها يُعارٌ فيقولُ يا محمد فاقول لا املك لك شيئاً قد بَلَغتُ ولا يأتي ببعير يحمِلهُ على رقبتِه لهرُغاءٌ، فيقول يا محمدُ فاقولُ لا أملكُ لَكَ شيئاً قد بَلّغتُ.

## تەرجەمە

٣٩٠ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (د) فەرمووی ووشتر لە ئەو پەڕی قەڵەوییو بە هێزی و باشی دێتە سەر خاوەنی خۆی وەکو زەکاتی لێ نەدابێ دەیخاتە ژێر قاچەکانی خۆی. پێی لێ دەنێ. مەڕیش دێنە سەر خاوەنی خۆی لە غایەتی بە هێزیو قەڵەوی وەکوو زەکاتی لێ نەدابێ لە ژێر قاچەکانی بەسمەکانی دەی شێلێ وە بەشاخەکانی دەیداتە بەر قۆچان. وە فەرمووشی لە حقوقی لاواندنەوەی هەژارانە لەسەر ئاو بدوشرێ بۆ خاتری هەر هەژارو پێویستێك بۆلای ئاوەکات لە شیرەکە پێیان بدەن یەکێك لە ئێوە شتێکی وانەکا مەڕێکی هەڵ گرتبێ رۆژی قیامەت بە بارە باری مەڕەکەوە بێتەلای من بەهاوار بڵێ یا محمد. منیش بڵێم هیچم پێ ناکرێ من ئەوی لە سەرم واجب بوو رام گەیاند هەڵی گرتبێ بە بۆرە بۆری ووشترەکەوە بڵێ بەهاوار ئەی محمد ئەجاتم بدە منیش بڵێم هیچم پێ ناکرێ بۆ تۆ بەراستی هەرچی واجب بوو رام گەیاندو تەبلیغم کردی.

٣٩١ عن أبي هريرَةَ (رَض) من آتاه الله مالاً فلم يؤدِ زكاتَهُ مُثِّلَ لهُ يومَ القيامَةِ شجاعاً أقرعَ له زبيبتانِ يُطوّقُـهُ يومَ القيامَةِ ثم يأخذُ بلهزمَتيهِ. يعني شدقيه ثم يقول أنا مالكَ انا كنزُكَ ثم تلا ولا يحسبنَ الذينَ يبخلونَ بما آتاهمُ الله من فضلِهِ هو خيراً لهم بل هوَ شرٌ لهم سيطوّقونَ (الاية).

## تەرجەمە

٣٩١ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) پێغەمبەر (د)

فەرمووی هەر کەسێك خودای گەورە مالێکی پێ دابی زەکاتیشی لێ نەدابی. مالەکە بۆی دەهێنرێتە سەر شکلی نێرە مارێك ڕۆژی قیامەت سەری بێ مووە. لەبەر ژەهری زۆرو پیری کەچەل بووە. دوو ژەهرڕێژی هەیە کە گیرەکانن. وەکوو تۆق دەخرێتە ملی ڕۆژی قیامەت لە پاشان دەی گری بە هەردوو لالغاوەی خۆی. پاشان پێی دەلێ من مالەکەی تۆم من خەزینەکەی تۆم. پاشان پێغەمبەر (د) ئەم ئایەتەشی خوێندەوە [ولا یحسبنَّ الــــذینَ یبخلونَ بما آتاهم الله هو خیراً لهم بل شرٌ لهم سیطوقون ما بخلوا بە) بۆ استدلال لەسەر فەرموودەی خۆی.

٣٩٢ عن ابي سعید (ض) قال النبي صلى الله تعالى علیه وَسَلَّم لیـس فیما دون خمس آواقٍ صدقـة. وَلیـس فیما دون خمـس ذودٍ صدقة. ولیـس فیما دون خمس أوسُقٍ صَدَقَة.

## تەرجەمە

٣٩٢ دەگـێڕنـەوە لە ئەبـوو سەعید. (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەو مالەی زەکاتی لێ دەکەوی ئەگەر زیوبوو لە پێنج ئوقیە کەمتر زەکاتی تیانی یە. هەر ئوقیە چل درهەمە هەمووی دەکا دووسەد درهەم لە هەر چل درهەم یەك درهەم زەکاتە. کە هەموو دەکا پێنج درهەم وەئەگەر ئەو مالەی زەکاتی لێ دەدری وشتر بوو. لە پێنج وشتری سێ سالی کەمتر زەکاتی نیە (یەعنی دەبی بۆ واجب بوونی زەکات لە وشتر بگاتە ئەوەلی نصابی کە پێنجە وە ئەگەر مالی زەکات دانەوێلە بوو وەکو گەنم و جۆ و نیسك و نۆك مثلا. لە پێنج وسق کەمتر زەکات نیە. کە هەر یەك وسق ٦٠٠ صاعە کە صاعێکش چوار مستە. کە هەر مستێکی ڕەتلێك و سێ یەکی ڕەتلە. بە ڕەتلی بەغدا

(ش) لەم حەدیثە پیرۆزە ئیمامەکانی مجتەهد ڕای جیاوازیان هەیە بەم تەرزە ئیمامی ئەعزەم کوتوویەتی دانەوێلە هەر چەندێك بێ کەم بی یاخۆ زۆر بێ زەکاتی تیایە.
ئیمامی مالك و ئەحمەد وتوویانە بە دەلیلی ئەم حەدیثە پیرۆزە ئەگەر لە سێ سەد ساع کەمتر بێ زەکاتی تیا نیە.

٣٩٣ عن أبي هریرة (ض). من تصدق بعَدْلِ تمرةٍ من کسبٍ طیب. ولا یَقبلُ الله الأ الطیب فان الله یتقبلُها بیمینه. ثمّ یُرَبِّیها لصاحبهِ کما یربّيَ احدُکُمْ فَلُوهِ حتی یکون مثل الجبَلِ.

## تەرجەمە

٣٩٣ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر (د) فەرمووی هەر کەسێك خێرێك بە هەژارو لێ قەوماوان بکا هەندەی یەك دانە خورما لە ماڵی حەلاڵی خۆی. کە حالیشی وایە ماڵ ئەگەر حەلاڵ نەبێ خودا قبووڵی ناکا. چونکی خودا صەدەقە قبووڵ دەکا لە ماڵی حەلاڵ بە دەستی ڕاستی قودرەتی خۆی پاشان بە خێوی دەکا بۆ صاحیبی خۆی چلۆنێك یەکێك لە ئێوە بە خێو دەکا جوانوی تازە لە شیر براوی خۆی. هەتاوەکوو هەندەی کێوێکی لێ دێ.

٣٩٤ عن حارِثة بن وَهْب. تَصَدَّقوا فإنّهُ يأتِي عليكم زمانٌ يمشِي الرجل بِصَدَقتِهِ فلا يَجِدُ من يقبلها يقول الرجُلُ لو جئتَ بها بالأمس لقبِلتها فأمّا اليوم فلا حاجة لِي بها.

## تەرجەمە

٣٩٤ دەگێڕنەوە لە حارثەی کوڕی وەهەب برای لە دایکی عبدالله کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بێ پێغەمبەر (د) فەرمووی خێر بکەن بە هەژاران چونکی زەمانێکتان بە سەردادێ. پیاو بەو شتەی کە دەیکاتە خێرەوە دەڕوا کەسێك نادۆزێتەوە خێرەکەی لێ وەربگرێ و بۆ هەر کەسێك بیبا. دەڵێ ئەگەر دوێنێ بتهێنا بوایە قبووڵم دەکرد بەڵام ئیمڕۆ پێویستم پێ‌ی نی‌یە (ش) ئەوەی دیارە لەم حەدیثە پیرۆزە بۆ ترساندنی ئەو کەسەیە کە زەکات دوا دەخا.
یا خۆ بەڕاستی لە زەمانی مەهدی یا عیسی خەڵکی زەکات قبوڵ ناکا چونکی بە هۆی پەیدا بوونی گەنجینەکانی عارد ماڵی زۆر دەبێ. خەڵکیش کەم دەبن. هیوا و ئومێدیشیان لەبەر باش بوونی خۆیان کەم دەبێتەوە.

٣٩٥ عن ابي هريرةَ (ض) لا تقومُ الساعة حتى يكثُرَ فيكم المالُ. فيفيض حتّى يُهِمَّ رَبُّ المال من يقبَلُ صدقَتَهُ. وحتى يعرِضَهُ فيقولُ اللذي يعرِضُهُ عليه لا آرَبَ لِي.

## تەرجەمە

٣٩٥ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ). پێغەمبەر (د) فەرمووی قیامەت دانایێ هەتا لە ئێوەدا ماڵ زۆر دەبێو هەڵدەڕژێ. وەهەتا خاوەن ماڵەکەی غەمناك دەکا کەسێك کە قبووڵی صەدەقەو زەکاتەکەی لێ بکا. وە هەتا دەی با بۆ کەسێك پێ‌ی بدا. دەڵێ هیچ پێویستم پێ‌ی نی‌یە.

٣٩٦ عن عَديٍّ ابن حاتم (ض) أما قطع السبيل فانهٔ لا يأتي عليك الاّ قليل حتى تخرج العيرُ الى مكة بغير خضير. واَمّا العيلة فان السّاعة لا تقوم حتى يطوف احدكم بصدقته. لا يجدُ من يقبلها منه ثمُ ليقفنَّ احدكم بين يدي الله ليس بينه و بينه حجابٌ ولا ترجهانٌ يُترجمُ له ثم ليقولنَ له الم أوتك مالا فليقولنَ بلى. ثم ليقولنَ الم ارسل اليك رسولاً فليقولنَّ بلى فينظر عن يمينه فلا يرى الاّ النار ثم ينظر عن شماله فلا يرى الا النار فليتقين احدكم النار ولو بشق تمرةٍ فان لم يجد فبكلمةٍ طيبةٍ.

## تەرجەمە

٣٩٦ دەگێڕنەوە لە عەدی کوڕی حاتم وتی: لە خدمەت حەزرەتی فەخری عالەم بووم دوو پیاو هاتنە خدمەتی. یەکەکی‌یان شکایەتی دەردی فەقیری دەکرد. ئەویتریان شکایەتی زوڵمی ڕێگرانی کرد.
پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەما ستەمی ڕێگران ڕانابوری لەسەر تۆ زەمانەکی کەم نەبی، هەتا وا ئەمین دەبی کاروان لە مەکەوە دەردەچی بەبێ ئەوەی کەس بیپارێزی. بەڵام دەردی هەژاریش بێ شك قیامەت دانایێ هەتا دەگەرێ یەکێکتان بەصەدەقەی خۆیەوە نادۆزیتەوە یەکێك صەدەقەی قبوول بکا لە پاشان ڕۆژی قیامەتیش رادەوەستی یەکێکتان لە پێش خودای گەورەی بەبێ تەرجەمان لە ما بەینی‌یان. ڕاستەو خۆ خودا پێی دەڵێ ئەرێ من مالم بەتۆ نەدا وەلام دەداتەوە دەڵێ: بەڵێ پێت دام پاشان پێی دەڵێ من پێغەرم بۆلای تۆ نەنارد وەلام دەداتەوە دەڵێ بەڵێ.
ناردت: پاشان تەماشای لایی ڕاستی دەکا هیچی تر نابینی ئاگر نەبی. پاشان تەماشای لایی چەپ دەکا هیچی تر نابینی ئاگر نەبی نینجا بۆ خۆتان باش بن با خۆی بپارێزی لە ئاگر هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەرچی بەکەرتە قەسپێکیش بی. ئەگەر ئەمەندەش نەبی وەلامی دەروزەکەر یان ئەوەی داوای شتێکتان لێ دەکا قسەیەکی خۆش بێ هەتا ببیتە هۆی ڕزگاربوون لە ئاگر.

٣٩٧ عن آبي موسى ليأتينَّ على الناس زمانٌ يطوفُ الرجل فيه بالصدقة من الذهب ثم لا يجد احداً يأخذها منه، ويُرى الرجل الواحد يتبعه اربعون امرأةً يَلُذنَ به من قِلّة الرّجال وكثرة النساءِ.

## تەرجەمە

٣٩٧ دەگێڕنەوە لە ئەبو موسی عبد الله کوری قەیسی ئەشعەری ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ پێغەمبەر (د) فەرمووی بێ شك زەمانێك دێتە سەر خەلکی پیاوی زەکات دەر

لەوزەمانە بە زەکاتی خۆیەوە دەگەڕێ یەك کەسی بە دەست ناکەوێ زەکاتەکەی لێ وەربگرێ. وە دەش بینرێ یەك پیاو چل ئافرەت دەچنە پاڵی بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباریان. لە بەرکەم بوونی پیاوان چونکە شەهید کراوون وە لەبەر زۆری ژنان (ش) لەبەر شەڕو کوشتاری زۆر لە ئاخری زەمان.

(۳۹۸) عن عائشةَ (رض) من اُبتليَ من هذه البناتِ بشيءٍ كنَّ له ستراً من النّار.

## تەرجەمە

۳۹۸ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە - ڕەزای خودای لێ بێ - فەرمووی ژنێك هاتە لام دوو کچی خۆی لەگەڵ دا بوو. داوای شتێکی لێ کردم. هیچی ترم شك نەدیت یەك دانە قەسپ نەبێ. پێم دا. ئافرەتەکەش کردی بە دوو لەت هەر کچە لەتێکی پێدا ژنەکە ڕۆیشت پێغەمبەر (د) هاتە لامان منیش حکایەتی حاڵی ئافرەتەکەم بۆ کرد.
فەرمووی هەر کەسێك یارمەتی ئەم کچە هەژارو موحتاجانەی‌دا بەشێك لە ئەحواڵی ئەوان بە پەروەردە کردن و بەڕێوە بردنیان. بۆ دایك و باوکیان ئەبن بە سەبەبی نەجات لە ئاگر. وە چوونە ناو بەهەشت.
(ش) لێرە وەرگیرا سونەتە صەدەقە با بەشتێکی کەمیش بێ وەکو کردەوەی عائشە وە دەشبیتە پەردە لە ئاگر وەکوو کردەوەی دایکی کچەکان.

۳۹۹ عن أبي هريرةَ (ض) اَن تَصدّقَ وانت صحيحٌ شحيحٌ تخشىٰ الفقرَ وتأمُلُ الغنىٰ. ولا تمهِل حتىٰ اذا بلغتِ الحلقومَ قُلتَ لفلانٍ كذا ولفلانٍ كذا وقد كان لفلانٍ.

## تەرجەمە

۳۹۹ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە - ڕەزای خودای لێبێ ئەبوو ذەر هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا کامە - صەدەقە - زۆر خێرترو باشترە فەرمووی ئەو خێرەیە کە لە حاڵی صحەت و تەندروستی بیدەی وەلەو کاتە بیدەی کە لە فەقیری و هەژاری بترسێی و چاوت لە دەولەمەندی بێ. نەکەی صەدقەی ماڵی خۆت دوا بخەی هەتا ڕوحت دەگاتە گەرووت وەقتی غەرغەرە. ئینجا بڵێی ئەمەندە ماڵە بۆ فلان بێو ئەمە ندەش بۆ فلان بێ لە میرات گران کە حالیش وایە بە گوێرەی میرات لێ گرتن ماڵەکە هەر بۆ ئەوان بووە لە دەست تۆ نەماوە چونکی ئەگەر میرات گر هەوەسی لێ نەبێ پێت ناکرێ لەسێ یەك زیاتر بکەیە وسیەت.

٤٠٠ عن عائشة ـ أطْوَ لكُنَّ يداً .

## تەرجەمە

٤٠٠ دەگێرنەوە لە حەزرەتی عائشە ـ رەزای خودا لێبی ـ هەندێ لە ژنەکانی پێغەمبەر لە پێغەمبەریان پرسی لە ژنەکانی تۆ کامەمان زووتر بە خزمەت دەگەین فەرمووی هەر کامێکتان دەستی دریژ تر بێ. قامیشێکیان هێنا دەستەکانی خۆیان پێ پیوا دەستی (سەو دە) کە ژنی پێغەمبەر بوو لە هەموان دریژ تر بوو. پاشان زانیمان مەبەستی لە دەست دریژی بە خشینی زۆرە واتە هەر کامێکتان زۆر تر ماڵ ببەخشێ.

ئینجا ژنەکانی پێغەمبەر (د) ئەگەر چی هەموویان بۆ خێرو چاکە کردن دریغیان نەدەکرد. بەلام حەزرەتی (زەینەب) چونکی ئافرەتێکی ئیش زان و کارکەر بوو نرخی ئیش و صنعەتەکەی خۆشی هەر دەبەخشی. بۆیێ لە پێش هەموو ئافرەتەکانی تر لە پاش مردنی پێغەمبەر (د) بە خدمەتی گەیشت.

٤٠١ عن أبي هريرة (ض) قال رجُلٌ لا تصَـدَّقَنَّ بصَدَقةٍ. فخرج بصَدَقته فوضعها في يد سارقٍ فاصبحوا يتحدثون. تصَدِقَ. فقال اللهمَّ لكَ الحمدُ. لا تَصَدَّقَنَّ بصَدَقةٍ فخرجَ بصَدَقته، فوضعها في يد زانيَةٍ. فاصبحوا يتحدثونَ تُصدق الليلة على زانية، فقال اللهمَّ لِكَ الحمد على زانيةٍ لا تصدقن بصَدَقةٍ فخرج بصدقتهِ فوضعها في يدِ غني . فاصبحوا يتحدثون تُصُدِّقَ على غني فقال اللهم لك الحمدُ. على سارقٍ وعلى زانيَةٍ وعلى غنيٍ فأتِيَ فقيل له .
أما صدقَتكَ على سارقٍ فلعلَّهُ ان يستعفَّ عن سرقته وامّا الزانية فلعلها ان تستعفَّ عن زناها وامّا الغني فلعلّه ان يعتبرَ. فينفق ممّا اعطاه الله .

## تەرجەمە

٤٠١ دەگێرنەوە لە ئەبوو هورەیرە ـ رەزای خودای لێ بێ ـ فەرمووی پێغەمبەر (د) پیاوێك لە ـ جوولەکە ـ گوتی بە حەقی خودا وا ئیمشەو صەدەقەیەك دەکەم. لە ماڵی چووە دەرێ صەدەقەکەی لە ناو دەستی دزێك دانا. قەومەکەی کەوتنە قسەو گفتوگۆ گوتیان بەسەر سوورمانێکەوە ئیمشەو صەدەقە بەدز دراوە. پیاوەکە گوتی خودایە زۆر سوپاس. ئەمەش بەویستی تۆ بوو. ئەگەرنا من چلۆن خێر بەدز دەکەم گوتی واللە ئیمشەو صەدەقە دەکەم. بە هەژارێك. لە ماڵی چووە دەرێ بە صەدەقەوە. لە ناوە دەستی ئافـرەتێکی زیناکەری دانا. بۆ سبەینە قەومەکەی کەوتنە گفتوگۆ.

گوتیان ئیمشەو صەدەقە دراوە بە قەحپەیەك. پیاوەکە گوتی سوپاس و ستایش بۆ تۆیە ئەی خودا.

ئەمەش بەویستی تۆیە، ئەگەرنا من چلۆن خێر بە قەحپە دەکەم. ئەمجارە دەبێ خێر بە موستەحەقێك بکەم. بە صەدەقەکەوە لە ماڵ چووە دەرێ صەدەقەکەی لەناو دەستی دەولەمەندێك دانا وەکوو کەوتنە سبەینە قەومەکەی گوتیان سوپاس و ستایش بۆ تۆیە لەسەر دزو لەسەر قەحپەو لەسەر دەولەمەند. چونکی ئەمانە. بە ویستی تۆیە. چاکەنە، قەی ناکا. پیاوەکە لە خەو دیتی پێ یان گوت صەدەقەکانت قبول بووە ئەما قبوول بوونی صەدەقە بەدز ممکنە لەوانەیە لەبەر ئەم خێرە کابرا دزی نەکا.

ئەما قەحپەکەش لەوانەیە بەو پارەی کە تۆ پێت داوە خۆ بپارێزی لە زینا. ئەما دەولەمەندەکەش لەوانەیە بە صەدەقەکەی تۆ پەندو عیبرەت وەرگرێ ئیتر واز لە خێر و صەدقە نەینی لەو مالی کە خودا پێی داوە.

(ش) لای ئیمامی ئەعزەم و ئیمامی ئەحمەد، ئەگەر کەسێك صەدەقەی واجب بداتە دەولەمەندێك لای وابێ فەقیرەو هەژارە ئەمە راستە.

بەلام لای هەرسێ إمام دروست نی‌یە دەبێ دیسان زەکات بداتەوە. ئەما لە صەدەقەی تطوع. واتە زەکاتی لەسەر نەبێ بۆخۆی خێر بکا ئەگەر بەنی‌یەتەکی باش بداتە دەولەمەندیش بە رای هەموویان دروستە.

٤٠٢ عَن مَعْن بن يزيد (رض) لَكَ ما نويْتَ يا يزيد و لَكَ ما اخذْتَ يا مَعْن

## تەرجەمە

٤٠٢ دەگێڕنەوە لە مەعنی کوڕی یەزید ـ رەزای خودای لێ بێ. گوتی من و باوکم یەزید وە باپیرم ئەخنەسی کوڕی حەبیبی سەلمی لە خدمەت پێغەمبەر (د). موسلمانان بووین. ژنیشی بۆ داخواز کردم فەرمانیشی بە من کرد ژن بێنە گوتم باشە یەزیدی باوکیشم چەند دینارێکی هێنا بووە دەرێ کە بەزەکات بدا پاشان لای پیاوێکی دانا لە مزگەوت منیش چووم دینارەکانم لە پیاوەکە سەند هێنامە لای باوکم باوکیشم وتی والله مەبەستی من ئەمە نەبووە وەکیلەکەم پارەکە بە خصوصی بە تۆ بدا بەلکی مەبەستم ئەوە بووە بدرێتە هەموو هەژاران مجاکەمەمان کەوتە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی یەزید لە صەدەقەت نیەتت چی بوو بۆ تۆ بوو یەعنی مەقصودی تۆ صەدەقە بۆ موحتاج بێ کوڕی تۆش موحتاجە ئەوی تۆش وەرت گرت ئەی مەعن بۆ تۆ بێ (صەدەکەش تطوع بوو).

٤٠٣ عن عائشة (ض) قال رسول الله تعالىٰ عليه و سلم إذا أنفقت المرأة من طعام بيتها غيرَ مفسِدَةٍ.
كان لها أجرُها بما انفقت و لزوجها أجره بما كَسَب و للخازن مثل ذلك و لايَنقُصُ بعضُهُم أجرَ بَعْضٍ شيئاً.

## تەرجەمە

٤٠٣ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو ئافرەتێك لە خواردنی ماڵی مێردی خۆی شتێکی بەخێر بەخشی بە نیـزنی مێردی لە عادەتیش بەدەر نەبێ. ئافـرەتەکە خێری چاکە بەخشینی خۆی بێدەگـا مێردەکـەش پاداشتی خۆی بۆ هەیـە چونکی ماڵەکە ئەو پەیدای کردووە مەئمووری ئەنباری زەخیرەش خێری خۆی هەیە وەکوو ئەوان هیچ کامێکیشیان کەم ناکاتەوە چاکەی ئەوانیتر بەڵکی هەرکەس بە گوێرەی حاڵی خۆی پاداشتی چاکەی خۆی پێ دەگا.

٤٠٤ عن حكيم ابن حِزام (ض) اليدُ العليا خيْرٌ من اليد السفلىٰ و ابدَء بمَن تعول و خير الصَّدقَةِ ما كانَ عن ظَهرٍ. غنِيٍّ و من يستعفف يعِفَّهُ اللّٰهُ وَ مَنْ يستَغنِ. يُغنِهِ اللّٰهُ.

## تەرجەمە

٤٠٤ دەگێڕنەوە لە حکیم کوڕی حزام کە لە ناو بەیت (کەعبە) لە دایك بووە. برازای حەزرەتی خەدیجەی گەورە بووە ـ سەدو بیست ساڵ ژیا شەصت ساڵ لە کوفـرو شەصت سالیش لە ئیسـلام لە عەرەفە سەد بەندەی ئازادکرد. لەمل هەر بەندەیەك تەوقێکی زیوهەبوو. لێی نووسرابوو (عتقاء الله عن حَكيم ابن حزام). واتە لە ئازادکراوانی حکیم کوڕی حزام). لە ساڵی پەنجای هجری لە مەدینە کۆچی دوایی کرد ـ ئەو پیاوە گوتی. پێغەمبەر (د) فەرمووی دەستی سەرەوە باشترە لە دەستی بنەوە. دەست بکە بەبەخشین بۆ ئەوکەسەی کەنەفەقەی لە سەرت واجبە باشترین صەدەقە لە حاڵی بێ احتیاجی بیکەی نەك ماڵ و مناڵت موحتاج بێ و خێر بە خەڵکی تر بکەی وە هەرکەسێك بی‌یەوێ خودا بێ گوناهی بکا دووری بکا لە حەرام و سۆال کردن لە خەڵکی.
خودا ئەو کەسە دەگێڕی بەبێ گوناه. وەهەر کەسێکیش داوا بکا خودا لە عالەم بێ نیازی بکا خودا بێ نیازی دەکا.

٤٠٥ عن ابن عمر (رض) اليد العليا خيرٌ من اليد السفلى فاليد العليا هي المنفقةُ والسفلى هي السّائلة.

## تەرجەمە

٤٠٥ دەگێرنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بێ. گوتی پێغەمبەر (د) لە سەرمنبەر بۆ هاندانی دەولەمەندان لە سەر صەدەقە و هاندانی هەژاران لە سەر عفەت (واتا خۆ پاراستن لە چلێسی) زەمی دەرۆزەکردن فەرمووی دەستی سەرەوە باشترە لە دەستی بنەوە دەستی سەرەوە لە ڕێی خودا ماڵ دەبەخشێ دەستی بنەوەش دەرۆزەکەرە.

٤٠٦ عن أبي موسى (رض) إشفعوا تؤجَروا ويقضيَ الله على لسانِ نبيِّهِ صلى الله عليه وسلم ماشاء.

## تەرجەمە

٤٠٦ دەگێرنەوە لە ئەبوو موسى ڕەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر (د) وەکوو دەرۆزەکەرێکی بۆ لای بهاتایە یا حاجەتێکی لێ بخواسترایە دەی فەرموو ئێوەش تکا بکەن خێرتان دەگاتێ وە خوداش حوکم دەکا لە سەر زمانی پێغەمبەری خۆی هەرچی لە ئەزەل ویستبی یەعنی دەرحەق بە سائل (واتە سواڵ کەر) یان ئەوی پێویستی‌یەکی هەبوو بێ چی دانابێ ئەو دەبێ کەوایە ئێوەش لە گەل من ببن بە واسطەو تکا کار بۆ جێ بە جێ کردنی پێویستی‌یان.
(ش) ئەمە لە ڕەووشتە باشەکان بوو هەتا هەوڵ بدەن بۆ جێ بە جێ کردنی پێویستی‌یەکانی ئەوانی خاوەن پێویستێ وە ئەمە ڕەووشت دار کردنی خۆیە بە ڕەوشتی خودا چونکی خودا خطاباً بە پێغەمبەری گوت إشفَع تُشفَع (واتا داوای لێ بووردن بکە خوداش لێ بووردنت قبوول دەکا).

٤٠٧ عن اسماء (ض) لا توكي فيوكى عليْكِ

## تەرجەمە

٤٠٧ دەگێرنەوە لە ئەسمانەی کچی ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خودای لێ بی - پێغەمبەر (د) فەرمانی بە من کرد سەری ماڵی خۆت مەبەستە لەوەی کە بیکە یەخێر لە ڕێگای خودا لە ترسی نەمانی ئەگەر نا لە سەر تۆش دەرگەی ڕزق گرێ دەدرێ.

٤٠٨ عن أسماء (ض) لا توعي فيوعي الله عليْكِ ارضخي ما استطعْتِ.

## تەرجەمە

٤٠٨ دەگێڕنەوە لە ئەسماء - رەزای خودا لێ بێ - پێغەمبەر (د) فەرمووی ماڵ بە من کۆمەکەوە وە مەشێرەوە ماڵ و ئەرزاقی خۆت لە هەژاران یەعنی رەزیل مەبە ئەگەرنا لە لایەن خودا تۆش تووشی هەژاری دەبی لەقەدەر تاقەتی خۆت ببەخشە با شتێکی کەمیش بێ.

٤٠٩ عن حكيم ابن حزام أسْلَمْتَ علىٰ ما سَلَفَ من خيرٍ.

## تەرجەمە

٤٠٩ دەگێڕنەوە لە حکیم کوڕی حزام تەرجەمەی حاڵی لە حەدیثی ژمارە (٤٠٥). رەدبوو. گوتی بە پێغەمبەرم گوت. من لە پێش اسلام لەزەمانی جاهیلیەتم صەدەقەم زۆر دەکرد ئایا ئەم کارە باشانەی من کەلکی قیامەتیان دەبی، فەرمووی تۆ موسلمان بووی لە سەر ئەو کارە باشانەی کە رات بوارد لە خێرو خوا پەرستی. یەعنی لە هەموو کاری باشی زەمانی جاهیلیەت و پێش اسلام بوونت پاداشتت پێ ئەدرێ.

(ش) ئەمە وایە لە خوا پەرستی یەك کە پێویستی بە نیەت نەبێ وەکوو بەندە ئازاد کردن مەثەلەن بەڵام خوا پەرستی یەك کە پێویستی بەنیەت هێنان بێ
وەکوو حەج دەبێ لە پاش موسلمان بوون بیکا حەجی زەمانی پێش اسلام بوونی بە هیچ حساب ناکرێ.

٤١٠ عن ابي موسى (ض) الخازنُ المسلم الامين الذي يُنفِذُ و ربّما قال يعطي ما أُمِرَ بِهِ كاملاً مُوَفَّراً طيِّباً به نفسُهُ فيدفَعُهُ الىٰ الذي أُمِرَ لَهُ بِهِ أحَدُ المتصدِّقينَ.

## تەرجەمە

٤١٠ دەگێڕنەوە لە ئەبوو موسی (ض) گوتی پێغەمبەر فەرمووی خەزنەداری سامانی دەولەمەندێك کە موسولمان بێ بێ خیانەت بێ کە فەرمانی گەورەی خۆی لە سەر شێوەیەکی مەشروع بە جێ بگەیەنێ. وە ببەخشێ ئەوەندەی ئەمری پێکراوە. بە تەواوی بەدلێکی خۆش بیشداتە ئەو کەسەی لە لایەن گەورەکەی ئەمری پێ کراوە کە بیداتێ. ئەم تەرزە خازنە یەکێکە لە دوو متصَدِّق (واتە خێرکەر) بەڵام پاداشتی

ئاغای خاوەن ماڵ دوو چەندانە دەکرێ لای کەمی یەک بەدە (١ بۆ ١٠) پاداشتی خازن واتە خەزنەدار دوو چەندان ناکرێ.

٤١١ عن أبي هريرة (ض) ما من يوم يصبحُ العباد فيه الاّ ملَكان ينزلان فيقول احدُهما اللهُمَّ أعطِ منفقاً خلَفاً و يقول الآخرُ اللهُمَّ أعطِ مُمسكاً تلَفاً.

## تەرجەمە

٤١١ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرە ـ رەزای خودای لێ بێ بە راستی پێغەمبەر (د) فەرمووی نی‌یە هیچ رۆژێک کە بەندەکانی خودا لەو رۆژە داخڵی سبەینە دەبن. مەگەر دوو لەمەلائکە دێنە خوارێ ئینجا یەکێکیان دەڵێ ئەی خودایە ببەخشە بەو کەسەی ماڵ لە پەرستنی تۆ سەرف دەکا. تۆڵەیەک لە جیاتی بەخشینەکەی ئەویتریشیان دەڵێ ئەی خودایە بدە ئەوەی کە ماڵی خۆی سەرف ناکا لە پەرستنی تۆ. بە لە ناو چوونی ئەو ماڵی کە هەیتی.
(ش) ظاهـری حەدیث عامە لە مەندوبات و واجبات بەلام ئەوەی مەندوبات دەکا موستەحەقی دوعا نی‌یە بە لە ناو چوون مەگەر رەزیلی‌یەکەی زۆر خراپ بێ‌و لە سنوور بەدەربێ بە قەطعی دلی إطاعە نەکا کەم و زۆر هیچ شت بداتە موستەحەق.

٤١٢ عن ابي هريرة (ض) مثل البخيل وَ المنفق كمثل رَجلين عليهما جُبَّتانِ من حديد من ثُديّهما الى تراقيهما فاما المنفقُ فلا يُنفقُ الاّ سَبَغَت او وَفَرَت. على جلده حتى تُخفي بَنانَهُ و تعفو أثرَهُ. و أمّا البخيلُ فلا يريدُ انْ ينفقَ شيئاً. الاّ لزقت كلُّ حلقةٍ مكانها فهو يُوسّعُها فلا تتسعُ

## تەرجەمە

٤١٢ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرە (رەزای خودای لێبێ) گوتی گوێم لێ بوو پێغەمبەر (د) دەی فەرموو سیفەت و وێنەی رەزیل و سەخی وەکوو صفەتی دوو پیاوانە جوبەیان لە بەربێ لە ئاسن لە مەمکی‌یانەوە هەتا ئێسقانی حەلقەی گەروویان ئنجا ئەوەی کەسەخی‌یە سەرف ناکا هیچ ماڵێک لە طاعەت مەگەر جوبەکەی فرەوان دەبێ‌و بە سەر پێستەیدا شۆر دەبێتەوە هەتا گەیەکانی ئەنگوستەکانیشیان بزر دەکا شوێنەواری رۆیشتنیشی رەش دەکاتەوە . لە بەر بەرینی و فرەوانی‌و درێژی. وە ئەما ئەوەی کە رەزیلە. نایەوێ سەرف بکا شتێک لە خوا پەرستی. مەگەر هەر حەلقەیەک لە جوبە ئاسنەکەی لە جێگای خۆی بە قالبی‌یەوە دەنووسێ ئنجا دەیەوێ

فرموانی بکا هەر چەند دەکا فرموان نابی (یەعنی رەزیل وەکوو بی یەوی صەدەقەیەك بکا، دڵەکەی تەنگ دەبی و قەبز دەبی دەستەکانی دەقووچی بۆی ناکری بە قەطعی بیەخشی هەتا جوبەکەی فرموان ببی.

٤١٣ عن أبي موسى (ض) على كلِّ مسلم صدقةٌ فقالوا يا نبيَّ اللّٰه فمن لم يجدْ قال يعمَلُ بيده فينفعُ نفسَهُ و يتصدَّق. قالوا فأن لم يجد. قال يعينُ ذاالحاجةِ الملهوف قالوا فأن لم يَجِدْ قال فليَعْمَلْ بالمعروفِ وَليمُسِكْ عن الشرِّ فانَّها له صَدَقَةٌ.

## تەرجەمە

٤١٣ دەگێڕنەوە لە ئەبوو موسای ئەشعەری ـ رەزای خودای لێبێ پێغەمبەر (د) فەرمووی لە سەر هەر کەسێ موسلمانە صەدەقە هەیە گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر هیچی نەبوو فەرمووی بە دەستی خۆی ئیش بکا کەلك بە خۆی بگەیەنێ. و بیکاتە صەدەقەش گوتیان ئەگەر چ ئیشەك نەبوو بیکا فەرمووی یاریدەی هەژار و ستەم لێ کراوان بدا گوتیان ئەگەر ئەوەش نەبوو فەرمووی بابە کاری باش و کردەوەی چاکەوە خەریك بی وە خۆشی کردەوەی خراپ نەکا و بێ شەرعی نەکا بە راستی ئەمە بۆ ئەو صەدەقەیە.

٤١٤ عن أمِّ عطيَّة (ض) عندكم شيءٌ فقلتُ لا. الاّ ما أرسلت به نُسيبةُ من تلك الشاةِ فقال هاتِ فقد بلغتْ محلَّها.

## تەرجەمە

٤١٤ دەگێڕنەوە لە ام عطیة ناوی نوسەیبە بوو گوتی مەڕێك لە صەدەقات بۆ نوسەیبەی ئەنصاریە ناردرا. ئەویتر بو حەزرەتی عائشەی نارد. پێغەمبەر (د) فەرمووی بە حەزرەتی عائشە لە خواردەمەنی هیچتان لا هەیە عائشەش گوتی بە غەیری ئەو مەڕەی نوسەیبە بوی ناردومە هیچی ترمان نی یە. پێغەمبەر (د) فەرمووی بۆم بێنە صەدەقەکە بە جێگای خۆی گەیشت کە درا بە نوسەیبە ئەمە ملکی نوسەیبەیە. بۆ ئێمەی ناردووە زەکات نی یە کە من ئەی خۆم.

٤١٥ عن أبي سعيد الخدري (ض) و يْحك انَّ شأنها شديدٌ فهلْ لك من إبلٍ تؤدِّي صَدَقَتها قالَ نعم قالَ فاعمَل من وراء البحار فانَّ اللّٰه لن يترك من عملك شيئاً.

## تەرجەمە

٤١٥ دەگێڕنەوە لە ئەبوو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرەبێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (د). دەربارەی کۆچ کردن بۆ مەدینە. واتە موبایەعەی لە گەل بکا لە مەدینەدا بنیشێ. چونکی خەلکی مەکە ئەبوو کە کۆچ کردنی لە سەر واجب بێ لە پێش داگیر کردنی مەکە لە لایەن موسولمانان. پێغەمبەر (د) فەرمووی وای بۆ حالی تۆ یەعنی دلم پێت دەسووتێ، بارکردن زەحمەتە هەموو کەس پێی ناکرێ. بە تایبەتی تۆ لە چۆلەوانی (بادیە) دادەنیشی ناتوانی لە شار بمینیەوە پاشان فەرمووی تۆ ووشترت هەیە کە زەکاتی لێ بدەی ووتی بەلێ: فەرمووی تۆ کردەوەی باشی خۆت بکە با لە پاش چەند بەحران بێ یەعنی ئەگەر تۆ فەرزی خودا بدەی گوێ مەدە ئەمە لە هەر جێگایەك بێ. لە نیشتمانی خۆت بێ یا لە جێگایانی دوور بێ چونکی بە بێ شك خودا کەم ناکا لە کاری خێری تۆ هیچ شتێك چونکی خودای گەورە (شەکورە) واتە هەر کەسێك هەر چاکەیەك بکا بە دوو چەندانە پاداشتی دەداتەوە.

٤١٦ عَن ابن عباس. إنَّكَ تقدَمُ علىٰ قوم أهل كتاب فليكن أوَّلَ ما تدعوهم اليه عبادةالله. فاذا عرفوا اللّه فأخبرْهُمْ انَّ اللّهَ قد فرَضَ عليهم خمسَ صلواتٍ في يومِهم و ليلتِهمْ. فاذا فعلوا الصلاةَ فاخبرهم انَّ اللّهَ قد فرضَ عليهم زكاةً تؤخذُ من أموالهم وتُرَدُّ على فقراءهم. فاذا أطاعوا بها فخُذْ منهم و توَقَّ كرائم اموال الناس.

## تەرجەمە

٤١٦ دەگێڕنەوە لە ابن عباس (ڕەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (د) مەعاذی کوڕی جەبەلی بۆ یەمەن نارد لەمە پێش ئەم حەدیثە ڕەت بوو. بەلام لێرە لە دوایی یەکی ـ تَوَقَّ ـ زیاترە. ئنجا ئەمری پێ کرد تۆ ڕەوانە دەکرێی بۆ لای قەومێ ئەهلی کتابێ لە پێش هەموو شتێك کە دەعوەتیان بکەی. بانگیان بکە بو خواپەرستی وەکوو خودایان ناسی. ئاگاداریان بکەوە کە خودا لە سەر ئەوان پێنج نوێژی فەرز کردوە لە شەوو ڕۆژێکدا وەکوو نوێژەکەیان کرد ئاگاداریان بکە کە خودا زەکاتی واجب کردوە لە مالی دەولەمەندان. دەربگرێ بدرێتە هەژاران وەکوو بە گوێیان کردی لێیان وەربگرە وە خوشت بپارێزە مالی هەلبژراویان لێ وەربگری بەم ئەرزە کامەی قەلەوە بۆ خواردن. یان تازە زاوەکە بۆ شیرەکەی لێیان بستێنی.
(مەعنا ئەوها مەکە)

٤١٧ عَن أنس (ض) بخ ذلك مالٌ رابحٌ، ذلك مالٌ رابحٌ و قد سمعتُ ما قُلتَ. و إنّي أرى ان تجعلها في الأقربينَ.

## تەرجەمە

٤١٧ دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خوای لێبێ ـ گوتی ئەبو طەلحە دەولەمەندترینی ئەنصار بوو لە مەدینە. شیرین ترین سامانیشی لای خۆی بوو کە (بەیرحابوو). ئەم بەیرحایە باغچەیەك بوو لە دار خورماو مێوەی خواردن شوێنەکەشی بەرامبەر مزگەوتی پێغەمبەر بوو هەر جارە پێغەمبەر دەچووە ناوی لە ئاوە بۆنخۆشەکەی دەخواردەوە. ئەنەس گوتی وەکوو ئایەتی (لن تنالوا البرَّ حتىٰ تنفقوا مما تحبّون) هاتە خوارەوە ئەبو طەلحە چووە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پەیغەمبەری خودا لەم ئایەتە دەفەرموێ. ئێوە خێری گەورەتان ناگاتێ هەتا سەرف دەکەن لە خواپەرستی ئەو مالی کە خۆشتان دەوێ وە شیرین ترین مالیشم (بەیرحایە) وە ئەمەشم گێڕا بە صەدەقە بۆ خودا ڕجا دەکەم بیرحا بۆم ببێ بە خێر بۆم ببێ بە زەخیرە لای خودای گەورە ئنجا چلۆنی دەکەیە خێر وای لێ بکە. بە کەیف خۆشی‌یەوە فەرمووی گەلێ باشە بە ڕاستی گوێم لە قسەت بوو ڕەئی من ئەوەیە بیگێڕی بەوەصیەت بۆ خزمەکانی نزیکت. ئەبوو طەلحە گوتی هەرچی لێ دەکەی بیکە ئەی پێغەمبەری خودا ئنجا ئەبوو طەلحە دابەشی کرد لە سەر خزم و ئامۆزایەکانی.

٤١٨ عن ابي سعيد الخدري (ض) ايّها الناس تصدّقوا. يا معشرَ النساءِ. تصدّقنَ فانّي رأيتكُنَّ اكثرَ اهلِ النار. تُكثِرْنَ اللّعنَ و تكفُرْنَ العشيرَ ما رأيتُ من ناقصاتِ عقلٍ و دينٍ أذهبَ للُبِّ الرَّجلِ الحازمِ مِن احداكُنَّ يا معشرَ النساءِ اي الزيانبِ. نعم. ائذنوالها صدَقَ ابن مسعود. زوجُكِ و ولدُكِ. احقُّ مَنْ تصدّقتِ بهِ عليهِمْ.

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو سەعیدی خودری (ض) ڕۆژێکی جێژنە. پێغەمبەر (د) چووە مزگەوت چەند فەرمانێکی بە پیاوان کرد. بە صەدەقە کردن. لە پاشان چەند ئامۆژگاریەکی ئافرەتانی کرد. کە صەدەقە بکەن. لە پاشان لە کاتی قسەکردن ڕووی لە ژنان کرد لە قسەکانی: فەرمووی ئەی جەماعەتی ژنان من دیتم ئێوە زۆرترینی ئەهلی ئاگربوون. ئافرەتان پرسیان لەبەر چی ئێمە زۆرترینی ئەهلی عەزابین. فەرمووی ئێوە بەزمانی خۆتان ناوەستن. لەعنەت لەشت دەکەن جنێو زۆر دەدەن.

بەهاکەی مێردتان نازانن. بەهاکەی خزمەکانتان نازانن ئەم دیوە بۆ لابردنی عەقلی پیاوی زۆرعاقل لە یەکێك لە ئافرەتانی کەم عەقل و کەم دین.
خراپتر ئەی جەماعەتی ژنان لە پاشان زەینەبی ژنی (کوری مەسعود) بۆ خانووی ـ سەعادەتیان چوو بە ئیزن خواستنەوە پێیان گوت کە زەینەب هاتوتە ـ خدمەت ـ فەرمووی کامە لە زەینەبەکان. پێیان گوت خێزانی (ابن مسعود) فەرمووی ئیزنی بدەن بلێن ئیزنـدرا پێی گوت ئەی پێغـەمبەری خودا تۆ ئیمرۆ ئەمرت فەرمووە بەصـەدەقە منیش هەندێ چەکو خشلم هەیە ئیرادەم وایە بیکەم بەصەدەقە. ابن مەسعودیش لای وایە کەخۆیو منالی خۆی لەهەمووکەس موستەحەق ترن کەپێ یان بدرێ. پێغەمبەر فەرمووی راست دەکا (ابن مەسعود)ی مێردت.
مێردی خۆت و منالی خۆت لە هەمووکەس موستەحەق ترن.
(ش) لەفظی صەدەقە فەرزو (نەفل) دەگرێتەوە. ئەگەرچی لەقسەکەش دا لایەنی (نـەفـل) تەرجیـح دەکـرێ. بەم حەدیثە کراوەتە بەڵگە کەدروستە نافرەت زەکات بەمێردی هەژاری خۆی بدا. ئەمە مەزهەبی ئیمامی شافعیو احمدە لە روایەتێك. ئەبوو حەنیفەو مالك و احمد قەدەغەیان کردووە لە روایەتێك حەملی حەدیثیان کردوتە سەر صەدەقەی مەندووبە.

٤١٩ عن أبي هريرة (رض) ليس على المسلم في فرسه وغلامه صدقة

تەرجەمە

٤١٩ دەگـێرنـەوە لە ئەبـوو هورەیـرە (رەزای خودای لێبێ) پێغەمبەر (د) فەرمووی نی‌یە لەسەر موسوڵمان لەجنس و وولاغی سواری خۆی وە لەعەبدو جاریەی خۆی زەکات.
(ش) بەڵام ئەگەر چەند وولاغێك و عەبدو جاریە بکرێ بۆ تجارەت (بازرگانی) لەمەدا زەکات واجبە بە ئیجماع.

٤٢٠ عن أبي سعيد الخدري. انَّ مِمَّا اخافُ عليكُمْ من بعدي مايُفتَحُ عليكم من زهرَةِ الدنيا وزينتها فقال رجلٌ أو يأتي الخير بالشرّ فقال ابن السّائل انّهُ لايأتي الخيرُ بالشرِّ وانَّ مِمَّا يُنبتُ الرَّبيعُ. يقتل او يُلِمُّ إلاَّ آكلةَ الخضراء. أكلت حتى اذا امتدَّت خاصرتاها، استقبلت عين الشمس فثلطت وبالت ورتعت. وانَّ هذا المال خضِرةٌ حُلوةٌ فَنِعْمَ صاحبُ المسلم ما أعطى منه المسكين واليتيم وابن السبيل أو كما قال

النبي (ص) وانَّه مَن يأخُذُه بغيرِ حقِّهِ. كالّذي يأكُلُ ولايشبَعُ. ويكون شهيداً عليهِ يومَ القيامَةِ

## تەرجەمە

٤٢٠ دەگێڕنەوە لە ئەبوو سەعیدی خودری ـ ڕەزای خودای لێبی ـ پێغەمبەر (د) ڕۆژێك لەسەر مینبەر دانیشت ئێمەش لە دەورەی دانیشتین. فەرمووی لەوەی کەمن لێی بترسم بۆ ئێوە لە پاش خۆم کولیکو زینەتی دونیایە لە سامان و دەسکەوتێکی کەخودا بە ئێوەی دەبەخشی. پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خودا نیعمەتێکی کە ماڵی دونیایە ئایا دەبێتە سزاو عەزاب پێغەمبەر (د) خۆی کرکرد ئەوانەی لەوێ دانیشتبوون بە پیاوەکەیان گوت تۆ بۆچی ئەم قسەت کرد وەڵامیشی نەدایەوە. وامان زانی وەحی بۆ دێتەخوارێ. ئەبوو سەعید گوتی ئارەقەی لە ڕووی پیرۆزی ئەستریەوە پاشان فەرمووی بەرێکی خۆش لە کوێیە ئەوی پرسیاری کرد. هەروەکوو سۆالەکەی پێ خۆش بێ. فەرمووی وانیە سزا بەچاکە بێ یا خۆ چاکەو خۆشی بەسزابێ. بەڵکی ئەوەی خودای گەورە دای نابی. کەخۆشیو چاکە هەر بە خۆشیو چاکەیە. ئەوەی داشی نابی سزاو عقوبەت بێ هەرسزاو عقوبەت دەبێ. نابێتە نیعمەت. بەڵام دوو مثالتان بۆ ڕوون دەکەمەوە مثالێك بۆ ئەو کەسەیە زۆر پەرۆش بێ بۆ ماڵ کۆکردنەوە. بەم تەرزە ئەم گیاو ـ ئەباتاتی کەخوداشینی دەکا لەبەهار. فعلاً دەکوژێ یا لە کوشتنی نزیك دەخا. وەکوو ئەو کەسەیە زۆر ڕشت (حەریص) بێ گەلەك حەزی لە کۆکردنەوەی ماڵی دونیابێ. تیایە کە فعلاً بە هیلاکی بدا لە دونیا بە ئەزیەت و عەزابی کۆکردنەوەی یا بەفەوتانی لەسەر ماڵی دونیا. لە ڕۆژی دوایی (ئاخرەت) بەعەزابی دووزەخ

لەبەر ئەمە کە لەبێ شەرعی سەرف دەکا حەقی خوای لێنەداوە.

مثالی دووەم. بۆ ئەوکەسەیە ماڵ پاشەکەوت دەکا. ئەویش وەکوو ئەو حەیواناتەیە. بێیەوێ گیایەکی شین و تەربخوا. خەریکی خواردن بی هەتا هەردوو کەلەکەی فرەوان دەبیو بەرین دەبی. پاشان ڕوو لە خۆر دەکاو تەرس دەکاو دەمیزیو دەلەوڕێ. بەبێ ترس. لەهەموو کارەساتێك. چونکی گیایەکی طەبیعەت گەرم و بەزیان و خۆشی نەخواردووە کەزۆری خواردبێ وەکو مثالی پێشوو بە هیلاك بچی وە بەراستی ئەم ماڵی دونیایە. دیمەنێکی سەوزی هەیە. تامێکی شیرینی هەیە. ئنجا چەند ڕەفیقێکی شیرینە بۆ صاحب ماڵێکی موسوڵمان، ئەو ماڵەی دەیدا بەفەقیرو هەژاران و هەتیوانو ڕەهگوزاران.

وه بەراستی ئەوکەسەی کەماڵ وەردەگرێ بەناحەق. وەکوو ئەو کەسەیە. هەر بخوا و فەت تێر نەبێ. وه رۆژی قیامەتیش شاهیدی لەسەر دەدا. دەیخاتە ناو بەندو جەزاو عەزاب.

٤٢١ عن زينبَ امرأة عبدالله. يا معشرَ النساءِ تصدَّقْنَ ولو من حُليكنَّ من هما قالَ بلالٌ زينبُ قال أي الزيانب. قال امرأة عبدالله قالَ نَعم. ولها أجرانِ اجرُ القرابَةِ واجرُ الصَّدَقَةِ

## تەرجەمە

٤٢١ دەگێڕنەوە لە زەینەبی خێزانی عبدالله ابن مەسعود ـ ڕەزای خودای لێبێ ـ حەدیثی ئەبوو سەعیدی خودری ژمارە (٤١٩) بەڵام لەم ڕوایەتە ئەمەندەی زیادە. زەینەب گوتی چووم بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) وەکوو دیتم ئافرەتێکیش لە ئەنصار بۆ عەینی پرسیارەکەی من هاتوەتە خدمەتی لە دەرگا ڕاوەستابوو بۆ ئیزن خواستنەوە بلال بەلاماندا ڕەت بوو پێمان گوت سؤال بکە لە پێغەمبەر (د) بۆ ئافرەت ڕاستە صەدەقە بە مێردی فەقیری خۆی‌و چەند هەتیوێکی خۆی بکا. بلال بە پێغەمبەری گوت پێغەمبەر (د) فەرمووی ڕاستە وەدوو پاداشتی هەیە. یەکەم پاداشتی خزمایەتی دووەم پاداشتی خێرەکە.

٤٢٢ عن أم سلمة (ض) انفِقي عليهم فلَكِ أجرُ ما انفقْتِ عليهِمْ.

## تەرجەمە

٤٢٢ دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران هندی ام سلمة (خ.ل) بە پێغەمبەری گوت. ئەری ئەجرو پاداشتم هەیە ئەگەر صەدەقە بدەم بەمناڵەکانی ابوسلمە چونکی مناڵی خۆمن (مندالەکانی پێنج بوون ١ـ سەلەمە ٢ـ عومەر ٣ـ محمد ٤ـ زەینەب ٥ـ دڕة.
وەکوو ابن عبدالاسدی ابو سلمە وەفاتی کرد پێغەمبەر مارەی کرد ئنجا لە جوابی ام سلمە پێغەمبەر فەرمووی خێرو صەدەقەیان پێبدە. بۆ تۆیە ثەوابی ئەو صەدەقەی کەپێیان دەدەی.

٤٢٣ عن أبي هريرة (ض) ماينقمُ ابنُ جميل الاّ انَّهُ كان فقيراً فأغناهُ اللّهُ

ورسولُهُ. وَأمّا خالِدُ فانكم تظلمونَ خالداً. قد احتبَسَ أدراعه وَ اعتدهُ. في سبيل اللّهِ وَامّا العبّاسُ ابنُ عبدالمطّلِب فَعَمُّ رسول اللّهِ (ص) فهيَ عليه صَدَقَةٌ ومثلُها مَعها.

## تەرجەمە

٤٢٣ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ـ رەزای خودای لێبی ـ پێغەمبەر ئەمری فەرموو بە حەزرەتی عومەر زەکات لە دەوڵەمەندان وەر بگرە حەزرەتی عومەر فەرمووی. ابن جمیل و خالدی کوڕی وەلیدو عباس کوڕی عبدالمطلب زەکات نادەن. پێغەمبەر (د) بۆ رۆن کردنەوەی هۆی نەدانی زەکاتی ئەمانە فەرمووی. (ابن جمیل) هەر بۆیە زەکات نادا چونکە هەژار بوو خوا دەوڵەمەندی کرد؟ ناحەقە ئەگەر زەکات نەدا وە ئەما خالدیش بەراستی ئێوە ستەم لەئەو دەکەن چونکی خالد کوڕی وەلید هەموو زرێیەکانی خۆیو وولاخ و چەکەکانی کەهەی بوو وەقف کرد بۆسەر مجاهدو شەرکەرەکان لە پێش ئەوەی ساڵ بەسەریاندا بسووڕێتەوە حەقی وەنی یە زەکات بدا.
ئەما عەباسی کوڕی عبدالمطلب مامی پێغمبەری خودایە صەدەقەی لەسەرە. وەهەندەی دیکەی صەدەقەشی لەسەرە یەعنی ئەو لەبەر ئەوەی خزمی پێغەمبەرە لە دەربارەی رێزو گەورەیی فەرقی هەیە لەگەڵ خەڵکی وای لێ دەوەشێتەوە دەربارەی خواناسین فەرقی هەبێ زیاتر بدا. راست ترینی هەموو قسەیەك ئەوەیە کە ئەم حەدیثە دەرحەق بە صەدەقەی فەرزە. وەکوو زەکات.

٤٢٤عَن ابي سعيد الخدري (ض) مايكونُ عندي مِن خير فَلَن أدَّخِرَهُ عنكم. ومن يستعفف يُعفَّهُ اللّهُ ومن يستَغنِ يُغنِهِ اللّهُ وَمَن يتَصبرْ يُصَبِّرْهُ اللّهُ. وما أعطِيَ احدٌ عطاءاً خيراً وأوسَعَ مِنَ الصبرْ.

## تەرجەمە

٤٢٤ دەگێڕنەوە لە ئەبوو سعیدی خودری رەزای خودای لێبی هەندێ لە ئەنصار ئەبوو سەعیدی کە ئەم حەدیثەی لێ دەگێڕنەوە لەوان بوو. بەخشینەکیان لە پێغەمبەر خواست پێی بەخشین دووبارە لێیان خواست پێی بەخشین جارێکی تریش لێیان خواست دیسان پێی بەخشین. هەتا هیچی لانەما فەرمووی هەر نیعمەتێکی لام هەبێ. هەڵی ـ ناگرم بۆ غەیری ئێوە ـ واتە هەڵیگرم بیدەمە یەکێکی دیکە. کەسێکیش خۆی لەوە بەرزتر بگرێ داوا نەکا. خودا بەرزی پێ دەبەخشی. لە حەرام دووری دەخاتەوە وە هەرکەسێکیش وا پیشان بدا دەوڵەمەندو بێ نیازە. خودا لە عالەم بی نیازی دەکا وە هەرکەسێکیش زۆر بەزەحمەت دەردی هەژاری بچێژێو

قبوولی بکا خودا صەبری بێ دەبەخشی نەدراوە بە هیچ یەکێك بەخشیشێك باشترو زۆرتــربێ لە چاکەی صەبرو خۆراگرتن لەسەر هەموو کارەساتێك چونکی صەبرو ئارام گرتن ـ هەموو رەوشتەکی باشی تێدایە، بۆیێ پێغەمبەر (د). بەماڵی دونیا لەبەر نەهێشتنی پێویست یان بێ‌ی بەخشین بەم قسە پیرۆزەش ئاگاداری کردن لەسەر زۆر لە رەووشتی باش، یەعنی بە مەنافعی مادیەو مەعنویە سوودی بێ گەیاندن.

٤٢٥ عن ابی هریرة (ض) والذي نفسي بيدِهِ لأن يأخذُ احدكم حبلَهُ فَيحتطِبَ عَلىٰ ظَهْرِهِ خيرٌ له مِن اَنْ يأتِيَ رَجُلاً فيَسْئلَهُ اعطاه أو مَنَعَهُ.

تەرجەمە

٤٢٥ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ـ خ.ل ـ پێغەمبەر (د). فەرمووی سوێندم بەوزاتــەی کە رووحم بەدەست ئەوە، بەبێ گومــان یەکێــك لە ئێوە. دەست بداتە گوریسەکەی خۆی، دارو پووشکە لەسەر پشتی خۆی کۆ بکاتەوە. باشترە لەمە کە بچێتە لای پیاوێك شتێکی لێ بخوازی چی بێ بدا بیخاتە ژێر باری مەمنونیەت یا بێ‌ی نەدا بەنائومێدی و مل کەچی رەوانی بکاتەوە.

٤٢٦ عن الزبير ابن العوام (ض) لأن يأخُذَ احدكم حبله فيأتى بحزمةِ الحَطب فيبيعها. فَيكفَّ اللّٰهُ بها وجهَهُ خيرٌ له من اَن يَسْئلَ الناسَ اَعطوه أو منعوه.

تەرجەمە

٤٢٧ دەگــێڕنــەوە لەزوبەیری کوری عەوام (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی بەمسوکەری یەکێك لە ئێوە گوریسەکەی خۆی هەل بگری بچی پشتی بەدارێك بێنی پاشان بیفرۆشی ئنجا خودا بەو پشتیە دارە. مەنع بکا ئاوی رووی لە رژانی باشترە بۆ ئەو لەوەی دەروزە بکا لە خەلکی بێ‌ی بدەن یا بێ‌ی نەدەن.

(ش) لەم حەدیثە پیرۆزە وا دەزاندرێ کە ئیش کردن بەدەستی خۆی بەرێزترە ئەك لە هەموو کارەکی باشترە. چونکی ئیمامی شافعی فەرموویتی بازرگانی لە هەموو کارەکی باشترە.

٤٢٧ عن حكيم ابن حزام يا حكيم انَّ هذا المالَ خَضرةٌ حُلْوةٌ فمن اَخَذَهُ بسخاوَةِ نفسٍ بورِكَ له فيه. وَمن اَخذَهُ باشرافِ نفسٍ لَمْ يُبارَكْ لَهُ فيه وكان كالّذى يأكُلُ ولا يشبَعُ. اليدُ العليا خيرٌ من اليد السفلىٰ.

## تەرجەمە

٤٢٧ دەگێڕنەوە لە حەکیم کوڕی حزام گوتی پرسیاری شتێکم کرد لە پێغەمبەر (د) پێی دام دووبارە لێم داواکرد دیسان پێی دام لە راستی دا سێ جار داوام لێ کرد هەرسێ جار پێی بەخشیم. پاشان فەرمووی ئەی حەکیم. بەراستی ئەم ماڵی دونیـایە بەدیمەن سەوزو جوانە. لەخصوص تام شیرینە ئنجا ئەگەر کەسێك ئەم ماڵەی وەرگرت بە عیزەتی نەفس و بەبێ حرص لەو ماڵە بۆ ئەو کەسە هەیە چەند سوود وەرگـرتنێـك وە هەرکەسێکیش وەری گرت بە طەلەبی نەفس و بە حەریصی لەوماڵەوە بۆ ئەوکەسە هیچ مەنفەعەت نییە. وەکوو ئەو کەسەیە هەر بخواو هەر تێر نەبێ. دەستی سەرەوەش کە هی ئەو کەسەیە کەماڵ دەبەخشێ باشترە لە دەستی خوارەوە کەوەر دەگرێ.

(حـەکیم گوتی بە پێغـەمبـەرم گوت بەحـەقی ئەو زاتـەی کەتـۆی ناردووە بە پێغـەمبەرایەتی لە پاش تۆ لە هیچ کەس شت وەرناگرم ئنجا حەزرەتی ئەبووبەکر بانگی کرد شتێکی پێ بدا. قبوولی نەدەکرد. حەزرەتی عومەر بانگی دەکرد لەفەیئ کە استحقاقی خۆی بوو شتێکی پێبدا. وەری نەدەگرت. حەزرەتی عومەریش لەبەر دادپەروەری خۆی دەی گوت ئەی موسڵمانینە ئێوە شاهێدبن حەکیم کوڕی حزام لە بەیت المـال مافی خۆی پێدەدەم لێم وەرناگری. خولاصە هیچی لەکەس وەرنەگرت لەپاش پێغەمبەر (د). هەتا لەپاش دەساڵ لە ئەمارەتی معاوية وەفاتی کرد.

(ش) ئەوەی گوتیتی زاناکان یەکن لەسەر نەهی کردن لە دەروزە بەبێ پێویستی هەوالانی شافعی اختلافیان لێ پەیابووە، لە مەسئلەی ئەوکەسەی تو[illegible]یە لەسەر کەسب بەگوێرەی ئەو کەسەی ئیشی پێ دەکرێ حەرامە. بەگوێرەی ئەم حەدیثە.

٤٢٨ عن عمر (رض) خُذهُ اذاجاءَكَ مِن هذا المالِ شئٌ وانتَ غيرُ مُشرِفٍ ولا سائلٍ فخذهُ. ومالا. فلا تتبعْهُ نفْسَكَ.

## تەرجەمە

٤٢٨ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عومەر (خ.ل) گوتی هەرجارە پێغەمبەر (د) شتی بەمن دەبەخشی منیش پێم دەگوت بیدە یەکێکی لەمن هەژارترو پێویست تر بۆ ئەم شتـە ئەویش فەرمـووی تۆ وەربگـرە ئەگەر لەعەینی ئەم ماڵە شتێکت بۆهات بێ تەمـەعیش بووی دەرحـەق بەو ماڵە وە نەشت خواست. وەربگـرە. وە ئەگـەر بەم صفـەتـەش نەبوو (یەعنی بۆت نەهات یاخۆ زۆرت هەوەس لێبوو). نەفسی خۆتی

بەدوومەخە وازی لێبینە یەعنی بەبێ ویستی تۆ ئەگەر شتێکت بۆ هەناردرا رەدی مەکەوە.

٤٢٩ عن ابن عمر (ض) مايزال الرَّجُلَ يَسْئَلُ الناسَ حتى يأتي يومَ القيامَةِ ليس في وجهه مُزْعَةُ لحمٍ. وقالَ انَّ الشمسَ تدنو يومَ القيامَةِ حتى يبلُغَ العرَقُ نصفَ الأذنِ فبينما هم كذلك استغاثوا بآدَمَ ثم بموسى ثم بمحَمّدٍ. (صلى الله تعالى عليه وسلم فيشفعُ ليُقضِي بين الخلْقِ فيمشي حتى يأخُذَ بحَلقةِ الباب. فيومئذٍ يبعثُهُ اللّهُ مقاماً محموداً يحْمَدُهُ أهلَ الجمعِ كلُّهمْ.

## تەرجەمە

٤٢٩ دەگێرنەوە لە عبداللەی کوری عومەر (خ.ل) فەرمووی پێغەمبەری خودا (د) پیاو هەیە هەموو کات دەروزە دەکات هەتا بەدەرجەیێک روژی قیامەت دێ پارچە گۆشتێک بەرووییەوە نەماوە وە فەرمووی پێغەمبەر (د). بێ گومان خور بەنزیک دەکەوی روژی قیامەت لەبەر گەرمایی عالەم ئارەقە دەکات هەتا نیوەی گوێی ئنجا ئەوەی رووی بێ گۆشتە عەزابی زۆرترە. ئنجا عالەم لەم تەنگاوە دانە هاوار دەبەنە بەر ئادەم پێغەمبەر سەلامی خوای لێبێ لە پاشان هاوار دەبەنە بەرموسی (سەلامی خوای لێبێ) ئنجا هاوار دەبەنە بەرمحەمەد(د) بۆ خاتری ئەوە کە لەخودای گەورە داوای ئەوە دەکا کە حوکم لە بەینی عالەم بکری. شەفاعەت دەکا. دەروا هەتا حەلقەی دەرگە دەگری. لەلایەن هەموو ئەوانەی لە دەشتی مەحشەر راوەستاون سوپاس و ستایشی دەکری بۆ یە بەمە دەگوتری (مەقامی مەحمود) یاخودا بە بەدکاری ئێمە نەکەی. بمان گەینی بەم شەفاعەتە گەورەیە.

٤٣٠ عن أبي هريرَة (ض) ليسَ المسكينُ الذي يطوفُ على الناس ترُدُّهُ اللقمَةُ. واللقمتانِ والتمرةُ والتمرتانِ ولكنَّ المسكينَ الذي لايَجدُ غِنى يُغنيه ولا يُفطَنُ به فيُتَصَدَّقُ عليه. ولا يقومُ فيسْئلُ الناسَ.

## تەرجەمە

٤٣٠ دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) بەراستی پێغەمبەر (د) فەرمووی وانیە هەژار ئەوکەسەبێ دەگەری لە سەر خەلکی. لە دەرگان لوقمەیێک کۆ دەکاتەوە یان دوو لوقمە وە دانە خورمایێک و دوو دانە خورما.. چونکی پێی دەکری خواردنی خۆی پەیدا بکا. بەلام هەژاری تەواو ئەوەیە. هەندەی نەبێ بێ نیازی بکا کەسیش

ئاگای له حالی ئەو کەسە نەبێ هەتا صەدەقەو چاکەیەکی لەگەڵ بکرێ هەڵیش نەستێ بۆ خۆی بگەڕێ داوا له خەلکی بکا.

٤٣١ عَن أبي حُميدِ الساعدي (ض) أخرُصوا أحصي ما يخرُجُ منها. آما انها ستهبّ الليْلة ريحٌ شديد فلا يقومنّ أحدٌ. ومن كانَ معهُ بعيرٌ فليعْقِلهُ كم جاءت حديقتكِ. إنّي متعجّلٌ الى المدينةِ فمَن أراد منكم آن يتعجّل معي. فليتعجّل. هذه طابةٌ. هذا جُبيْلٌ يحبنا ونحبُهُ الا اخبركم بخيرِ دور الانصار دورُ بني النجار. ثمّ دور بني عبدِ الأشهل ثم دور بني ساعِدة. اودور بني الحارث ابن الخزرج وفي كلّ دور الانصار. يعني خيرا.

## تەرجەمە

٤٣١ دەگێڕنەوە له ئەبوو حومەیدی ساعدی (ض) بۆ غەزای تەبووك چووین له خزمەت پێغەمبەر (د) وەکوو گەیشتینە وادی القری (شارێکی قەدیمەیە له بەینی مەدینەی شریفە و شام دیتمان پیرە ژنێك له ناو باغێکی دار خورمایە. ملکی خۆیەتی پێغەمبەر ئەمری فەرموو ئەم باغە بقرسێنن یەعنی بەرو بوومەکەی تەخمین بکەن. پێغەمبەر خۆی تەخمینی فەرموو. بەدە [١٠] وسق بە پیرە ژنەکەشی فەرموو ئەو مقداری کەلێی دەردەچی بەعەیار حسابی ضەبط بکە (یەعنی ئەوەك لەگەڵ تەخمینی من رێك نەکەوێ پاشان گەیشتینە تەبوك. فەرمووی ئاگاداربن ئیمشەو بایێکی زۆر توند دێ هیچ کەسێك هەڵنەستێ هەرکەسێ وشتریشی هەیە با عەقالی بکا واتا بیبەستێتەوە. وشترمان عەقال کرد. بایێکی زۆر توندهات پیاوێك هەڵستا له سەر پێچەوانەی ئەمری پێغەمبەر (د) فرمیدا کێوی [طەیّ]. پاشای ئەیلە (شارێکی کۆنە له سەر دەریای ناوەراستە.) هێسترێکی سپی بۆ پێغەمبەر نارد. پێغەمبەریش (د) بە کورتەکەکی زۆر نا یاب له بەرامبەر ئەوە پێی بەخشی (ئەم هێسترە سپی یە ناوی دلدل بوو. غەیری ئەم هێسترەی بوو لەغەزای حونەین له پاش گرتنی مەکە سواربو بوو .چونکی ئەمە فەروەی جوذامی بە دیاری بۆی ناردبوو ئەمەش سپی بوو. هێسترێکی تریشی هەبوو ناوی (فضە) بوو. هێسترێکی تریشی هەبوو کیسری بە دیاری بۆی ناردبوو. هێسترێکی تریشی له دومة الجندل بۆ هاتبوو. یەکێکی تریشی لای نەجاشی بۆی هاتبوو کاغەزێکیشی بۆ پاشا نووسی ناوەروکی کاغەزەکە (هەرچی) له ژێر ئیدارەی یو حەنای کوری رۆبە دایە له لێواری دەریا ئەمین بن. هەندێ جزیەشی له سەر دانان.) پێغەمبەر (د) وەکوو گەراوە بۆ مەدینە.
گەیشتنە وادی القری. له پیرەژنی ما خۆی باغی پرسی. باغەکە ـ میوەکەی چەند بوو

گوتی ده وسق بوو له سەر قرساندنی پێغەمبەر (د) پاشان فەرمووی من بۆ مەدینە بە پەلەم لە ئێوەش ئەگەر کەسێك دەیەوێ پەلەبکا با لەگەڵ من بێ. ئنجا وەکوو لە مەدینــە بە دیارکەوتن فەرمووی ئەوە شاری طابەیە وەکوو چاوی بە کێوی ئوحود کەوت فەرمووی ئەوە کێووکەیە بە کچکە کردنەوە. ئێمەی خۆشدەوێ ئێمەش ئەومان خۆشدەوێ.

(ش) انکار ناکرێ خۆشەویستی داروبەردو درەخت و دەریا (جەمادات). دەرحەق بە پێغــەمبــەر (د) هەر وەکــوو ئەستوندە بە نزگرمێکی زۆر لە جودا بوونەوەی لە پێغەمبەر (د) دەستی بە گریانێکی واکرد کۆمەڵی یارانی پێغەمبەر لە سۆزو گریانی ئەستوونە متأثر بوون هەتا پێغەمبەر (د) باوەشی تێ وەرهێنا. کرنەبوو پاشان بە دوان بە هەڤــالانی خۆی گوت ئا گاداربن من خەبــەرتــان دەدەمێ بە چاکترین قەبائلی ئەنصار لە مەدینە گوتیان بەڵێ فەرمووی چاکترینیان. قەبیلەی بەنی ئەجارە یەعنی تەیمی کوڕی ثەعلەبە بۆیە ئەجاریان پێ گوتووە. چونکی بە تەوشوو ئاڵەتی خۆی - سونەت کردووە. پاشان قەبیلەی بەنی عبد الاشهلە. پاشان قەبیلەی بەنی ساعدەیە. یا خۆ قەبیلەی بەنی حەرثی کوڕی خەزرەجــە خێرو چاکــە لە هەمــوو قەبیلەکانی ئەنصار هەیە.

(ش) لەم حەدیثە وادەزاندرێ. قرساندن دروستە. بەڵام ئایا هەر بۆ خورمایە. یاخۆ مولحەق بە خورماشتی تریشی تیایە. یاخۆ عامە واتە گشتییە لە هەموو مێوەیەك بە تەڕیو بەووشکی بە کەڵك بێ. شورەیحی قازیو هەندێ ئەهلی ظاهر حوکمیان بە قســەی یەکــەم کردوە جمهوریش بە قسەی دووەم. بو خاریش حوکمی بەقسەی سێیــەم کردوە پاشان ئایا دروستە ئەوەی تەخمین دەکا یەکێکی دادپەروەرو قابلی شەهــادەت بێ. یاخۆ دەبێ دووکەس بن لە مەدا ئیمامی شافعی دووقسەی هەیە جمهــوریش لە سەر قســەی پێشــووە لە بەر حەدیثی ئەبوو داود پێغەمبەر تەنیا عبداللەی کوڕی رەواحەی دەنارد بۆ تەخمینی باغاتی خەیبەر. وەمطابق دەرچوونی تەخمینی پێغەمبەر (د) لە باغی پیرە ژن. وە خەبەر دانیشی بەبایی توند لە تەبووك لە معجزاتی دیارە

٤٣٢ عن عبد الله ابن عمر (ض) لِما سقت السَّماءُ والعيونُ وكانَ عَثرِيّاً العُشرُ وما سُقِيَ بالنضح نصفُ العُشرِ.

## تەرجەمە

٤٣٢ دەگــێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی

لەوكشتوكاڵەی باران ئاوی ئەداوە چونکە ئاوی دەدا یا خۆ لافاو ئاوی دەدا زەکات دەییکە. وە ئەو کشتوکاڵەی بە هەڵهێنجان ئاو دەدری نیوەی دەییکە یەعنی بیستیکە). زەکاتەکەی لە هەر دوو بەشدان ئەگەر بگاتە حەدی نصاب واتە ئەو رادەیەی زەکاتی لێ دەکەوێ کە پێنج وسقە.

٤٣٣ عن أبي هريرة (ض) أما علمت انَّ آلَ محمدٍ لا يأكلونَ الصدقةَ وفي روايةٍ أخرى كخ كخ. أما شعرتَ أنّا لا نأكُلُ الصَّدَقةَ

تەرجەمە

٤٣٣ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (خ.ل) وەکوو خورما بێ دەگەیشت و خورمایەکانیان لە دار دەکردەوە هەرکەس دەیەکی خورمای خۆی بەزەکات دەیان - هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر (د) هەتا میقداریکی زۆر کۆ دە بۆوە. حەزرەتی حەسەن و حوسەینیش کەمیان بە خورمایەکە دەکرد حەسەن دانە خورمایەکی خستە ناو دەمی پێغەمبەر. تەماشای کرد بە خۆی لە ناو دەمی هێنایە دەرێ فەرمووی ئەت زانیوە ئالی محمد کە ئەوەکانی هاشم و مطلبن لای شافعی لای حەنەفیو مالك ئالی محمد تەنیا ئەوەکانی هاشمە صەدەقەو زەکات ناخۆن (ش) لەم حەدیثە بەدیار دەکەوی هەمووی دەگرێتەوە صەدەقەی واجب وسونەت بەڵام سیاقی حەدیث تەخصیص دەکا بەواجبە چونکی ئەوی حەرام بێ بۆ ئالی محمد هەر زەکاتی فەرزە.

لەم حەدیثە وەرگیرا ئەگەر چی مندال موکەلەف نییە بەڵام دەپارێزرێ لە حەرام وەکوو گەورەوە هۆیەکەشی بۆ رۆن بکرێتەوە هەتا لە پاش بلوغ و گەورەبوونی بە گوێرەی شریعەتی ئیسلام بجووڵێتەوە.

٤٣٤ عن عمر (ض) لا تشترِهِ. ولا تَعُدْ في صَدَقَتِكَ وان أعطاكَهُ بدرهمٍ فانَّ العائدَ في صَدَقَتِهِ كالعائدِ في قيئِهِ.

تەرجەمە

٤٣٤ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عومەر (خ.ل). تەمیمی داری ئەسپێکی بە دیاری بۆ پێغەمبەر ناردبوو ناوی [وەرد] بوو. پێغەمبەر (د) بە حەزرەتی عومەری بەخشی ئەویش دایە پیاوێك لە رێی خودا. غەزای پێ بکا پیاوەکەش چونکە لە خدمەتی وولاغەکە درێغی دەکرد وولاغەکە رەق و لاواز بوو. حەزرەتی عومەر فەرمووی ویستم

لێی بکـرم لام وابوو بەهەرزان دەدا پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (د) فەرمووی لێی مەکـرە لەو خێرو صەدەقـەی خۆت مەگـەرێـوە (یەعنی بەرێگای کرین). بابەیەك درهەمیشت بداتێ چونکی ئەوکەسی بگەرێتەوە لەو ـ صەدەقەی کردوویەتی. وەکوو کەسێکە ڕشابێتەوە وەرشانەوەکەی خۆی بخواتەوە (ش) ئەم وێ چواندنە بەم شتە پیسـە مەبـەست ئەوەیە کە خەلکی لێی دووركەونەوە ئەگەرنا حەرام نی‌یە بەلکێ مەبـەست لە نەکردنی ئەو کارە لای قەولی صەحیح بۆ خۆپاراستنە لەم کارە لای هەندەکانیش دەلێن حەرامە.

٤٣٥ عن ابنِ عباس (رض) هَلاّ انتفعتُم بجِلْدِها إنَّما حَرُم أكلُها.

## تەرجەمە

٤٣٥ دەگێڕنـەوە لە کوڕی عبـاس (خ.ل) پێغـەمبـەر (د) تووشی مەرێکی مردارهـات لە زەکـات. مرابووە جاریەی ئازاد کراوی مەیمونەی دایکی ئیمانداران فەرمووی بۆچی بۆ خۆتان کەلك وەرناگرن لە پیستەکەی گوتیان مردار بووە. فەرمووی خواردنی حەرام بوو بەلام پیستـەکـەی بەدەباغ پاك دەبیتەوە. (ش) ئەم حەدیثە دەلیلە کە ژنەکانی پێغەمبەرو جاریە ئازاد کراوەکانیان صەدەقەی واجبەو نافلەیان بۆ حەلال بووە نەك عەبدی ئازاد کراوی پێغەمبەرو عەبدی ئازاد کراوی نەوەی هاشم ونەوەی مطلب بۆ ئەوان حەرامە.

٤٣٦ عَن أنَسٍ (رض) هُوَ عليها صَدقَةٌ ولنا هديَّةٌ.

## تەرجەمە

٤٣٦ دەگێڕنـەوە لە ئەنەس (خ.ل) ـ بەریرە ـ هەندێ گۆشتی صەدەقەی بەدیاری بۆ حەزرەتی عائشە هینا بوو. ئەویش بۆ پێش پێغەمبەری هینا. حیکایەتی بەریرەشی بۆ کرد فەرمووی ئەم گۆشتە بۆ بریرە صدقەیەوە بۆ ئیمەش دیاری و هدیەیە.

(ش) صەدەقـە بەخشینەکە بۆ پاداشتی رۆژی دوایی. دیاری بەخشینەکە لەبەر ڕێزگرتن و گەورەیی ئەوەی دیاریەکەی بۆ هاتووە.

ئنجا لە صەدەقە ئەوعە زیلەتێك هەیە بۆ ئەوەی وەری دەگری بۆیێ حەرام بووە. بۆ پێغەمبەر (د). لەم حەدیثە وەرگیرا کەسێکی پێویست ئەگەر صەدەقەیەکی پێ درا ئەبێتە مولکی ئەو. بۆی هەیە ئەویش بە دیاری بینێری.

٤٣٧ عن ابن عباس (ض) واتّقِ دعوةَ المظلوم فانّهُ ليسَ بينهُ وبين اللهِ حجاب.

## تەرجەمە

٤٣٧ لە حەدیثی موعاذ وەکوو پێغەمبەر (د) رەوانەی کرد بۆ یەمەن لە جوملەی ئەمرو ئامۆژگاری ئەمەندەش بوولەوێ ئەنووسرا. بۆ تەواوکردن لێرە دەی نووسین فەرمووی ئەی مەعاذ بترسێ لە دوعای بەسوزی ستەم لێ کراو (مەظلوم). چونکی هیچ پەردەیێک لە بەینی ستەم لێ کراوو خودا دا نییە. با ئەو ستەم لێ کراوە گوناهکاریش بێ

٤٣٨ عن عبدالله ابن ابي اوفى. اللهمّ صَلِّ على آلِ آبي أوفى. اللهُمَّ صَلِّ على آلِ فلان.

## تەرجەمە

٤٣٨ دەگێرنەوە لە عبد اللەی کوری ئەبوو ئەوفێ وەکوو قەومێک زەکاتی ئەموالی خۆیان بهێنایە. بۆ پێغەمبەر (د) دەی فەرموو اللهمَّ صَلِّ على آلِ فلانٍ. ئەبو ئەوفا زەکاتی خۆی بۆ هێنا فەرمووی اللهمَّ صَلِّ على آبي اوفى ـ
(ش) دروستی ئەوە لە خەصائصی پێغەمبەرە چونکی بۆ ئێمە مەکروهە ـ نابێ ـ بەئەبوونیکی خۆ پاراستن لێی. لای قسەی راست (قەولی صەحیح). صەلەوات کردن لە سەر غەیری ئەنبیا ـ نابێ چونکی ئەو درووده بۆ پێغەمبەرانە دروشمی ئەوانە. ناگوترێ ئەبو بکری صدیق ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ یان دروودی خوای لە سەربێ. با مەعناشی تەواو بێ هەرچۆن نابێ بگوترێ محمد عزَّ وجَلَّ. با پێغەمبەر خۆشەویست و گەورەش بێ چونکی دروشمی خودایە جَلَّ جَلالە.

٤٣٩ عن آبي هريرة . انَّ رَجُلاً من بني اسرائيلَ سألَ بعض بني اسرائيلَ بأنْ يُسلِفَهُ. الفَ دينارٍ فدفعها إلَيْهِ. فخرجَ في البَحرِ فلم يجِدْ مركباً فأخذَ خشَبَةً. فنقرها. فادخلَ الفَ دينارٍ. فرمىٰ بها في البَحرِ. فخرَجَ الرجُلُ الذي كان أسلَفَهُ. فاذا بالخَشَبَةِ. فأخذَها لأهلِهِ حطباً. فذكر الحديثَ فلّما نَشرَها وجَدَ المالَ.

## تەرجەمە

٤٣٩ دەگێرنەوە لە ئەبوو هورەیرە (خ.ل) پێغەمبەر (د). فەرمووی پیاوێک لەبەنی اِسرائیل بە پیاوێکی تری گوت لە بەنی اسرائیل کە هەزار دیناری بە قەرد

بداتێ. قەردەکەی دابێ. پیاوە قەردارەکە بۆسەفەری بەحر دەرکەوت. لەگەرانەوە بۆ نیشتمانی خۆی هیچ کەشتی‌یەکی دەست نەکەوت پێ بگەرێتەوە وەعدەی قەردەکەشی تەواو بوو بوو پارچە دارێکی هێنا ناوەکەی کۆڵی هەزار دینارەکەی خستە ناو دارەکە. دارەکەشی فرێدا ناحەریا پاشان پیاوەکەی خاوەن قەرد چونکە وەعدەی تەواو ببوو.

لە چاوە رێی پارەکەی خۆی بۆ لای بەحر چووە دەری دیتی کۆلکە دارێك لەوێ کەوتووە هەڵی گرت. هەتا لە ماڵ بیسووتێنێ. ئنجا ئەبوو هورەیرە حەدیثەکەی بە تەواوی گێراوە. لە باسی (کە فالەت)

لە بوخاری‌دا هەیە. وەکوو دارەکەیان شەق کرد تەماشای کرد ماڵەکەی بە تەواوی لەوێ دایە (ش) ئەم حەدیثە دەلیلە لە سەر دروست بوونی هەلگرتنەوەی هەرشتێکی کە دەریا فرەی دەدا. وەکوو عەنبەرو لۆلۆو مرواری تریش. چونکی مادام کولکەدار بووە ملکی ئەوکابرایە. کە پێشتر ملکی یەکێکی دیکە بووە. دروست بوونی کردنە مجەوهەرات بە مولکی خۆت. کە پێشتر ملکی کەسێك نەبووە بە طریق الاولی واتە بەبێ‌گومان ـ دروستە.

٤٤٠ عن أبي هريرة (ض) العجماءُ جبارٌ والبئرُ جُبارٌ والمعدنُ جبارٌ وفي الرّكاز الخمُسُ.

## تەرجەمە

٤٤٠ دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی تاوانی حەیوانی سەربەخۆ بێ صاحب بێ‌تۆڵەیە. تاوانی بیر کەخاوەنی لە عاردی خۆی لێ‌ی دابێ بەشێوەیەکی مەشروع بێ تۆڵەیە. هیچ تۆڵەیەك لە خاوەن بیر وەرناگیرێ ئەگەر یەك بکەویتەناوی.

وە بیرو قۆرتی مەعادن بۆ دۆزینەوەی ئاسن یا پاقر وشتی تر کەلێ دەردەهێن ئەگەر کەسێك بکەویتە ناوی یا بەسەری‌دا برووخێ بێ تۆڵەیە. وە لەو گەنجینەیەی کەپێش هاتنی پێغەمبەر هەبووە پێنجێك هەیە. یەعنی هەر کەسێك بیدۆزیتەوە ئەبێ لە پێنج بەش بەشێك بداتە (بیت المال)

(ش) حەیوانێك بەرەڵابوو انسانێکی کوشت یامالێکی فەوتاند. هیچ تۆڵە لە سەر خاوەنی نی‌یە بەلام ئەگەر خاوەنی لە گەلێ دابێ دەبێ تۆڵەی بدا. هەر چی یەکی فەوتاندبێ. بەرۆژبێ یان بەشەوبێ. خاوەنەکەشی ئەگەر لە سەر پشتی ئەم وولاغەبێ یان بێ هاژوا خاوەنی حەیوانەکەبێ یا بە کرێی گرتبێ یا زەوتی کردبێ

ئەو حەیوانە کە بێتە سەر ئەو مالە یان ئەوا ئینسانە یا جۆتکەی لێ دابێ یا قەپاری لێ گرتبێ. یا بەکڵکی.

مالی ریکازیش کەم بی یان زۆر بێ ۱/٥ پێنج یەکی بۆ (بیت المال)ه. لای ئەبوو حەنیفەو مالك و ئەحمەدوە قسەی کۆنی شافعی.

بەلام لای قسەی تازەی شافعی نصاب شەرطە - واتە دەبی زەکاتی لێ بکەوێ بە گوێرەی ئەوەندەی کە شەرع داینای. ئەگەر ئەگەیشتە نصاب زەکاتی لە سەر نی یە.

تەنیا ئەگەر لە ملکی خۆی بێ - پارەکەش - نەقدی - بێ. چی لە ناو کافران بێ یان لە ناو مسلمانان بێ لای هەر چوار مەزهەب و جمهوری علما.

بەلام لای حسن گوتیتی ئەگەر لە دار الحرب بێ خمس ۱/٥ تیایە - ئەگەر لە وولاتی اسـلامیش بێ چوار یەکی دەیەکی ئەومالە زەکاتە مەرجی واجب بوونی زەکاتیش دەبێ یا زێر بێ یازیو بێ. ئیمامی ئەحمەدیش گوتیتی ئەگەر نەقد یش بێ. وەکوو ئاسن و سفر مثلاً حەنیفەش وا دەلێ. بەلام خومسیان - واتە پێنجیکیان واجب کردووە گێراویـانـە بەفـەیئ حەنبەلیەکانیش روبعی عوشریان واجب کردووە واتە چارەکی دەیەکی. گێراویانە بەزەکات

# ( كتاب الحج )

# باسی حەج کردن

٤٤١ عن ابن عباس (ض) قالت إمرأة إنَّ فَريضَةَ الحَجِّ ادركت أبي شيخاً كبيراً لايَثبُتُ على الرّاحِلَةِ أفَاَحجُّ عنه . قال صلى الله عليه وسلم نَعَمْ

## تـەرجـەمـە

٤٤١ دەگـێـڕنـەوە لە کوری عەبـاس (خ.ل) فضـل کوری عەباس لە پاش پێغـەمبـەر (د) سوار ببـوو، ئافرەتێکی خەثعەمی یەمەنیە هات فەضل تەماشای ژنـەکەی کرد ژنەکەش تەماشای فەضلی کرد چونکە هەردووکیان زۆر جوان بوون پێغەمبەر (د) خەریك بوو بەری فەضلی دەسووڕاند ئافرەتەکە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا حەج لەسەر باوکم واجب بووە بەپیری موسولمان بووە. بەلام زۆر پیرە خۆی لەسەر وولاغ راناگری ئەگەر من حەجی بۆ بکەم دروستە فەرمووی (د) دروستە.

(ش) ئەمـە لە حجـة الوداع بوو دروست بوو لەودا حەج لە جیـاتی غەیـری حەنەفیەکان تەواوی ئەم حەدیثە یان گرتوو.

لەسەر تەواوی ودروستی حەجی کەسێك کە بۆ خۆی حەجی نەکرد بێ. لە جیاتی یەکیکی تر حەج بکا لەسەر خلاف (پێچەوانەی) جمهوری علماو مذاهب کە گوتوویانە دەبێ بە دڵ خۆی پێشتر حەجی کردبێ بە دەلیل حەدیثی کوری عەباس پێغەمبەر (د) گوێی لێبوو پیاوێك دەیگوت [لَبَّیْكَ عَنْ شُبْرَمَةَ]. پێغەمبەر لێی پرسی تۆ بۆ خۆت حەجت کردووە گوتی نا. فەرمووی ئەم حەجە بۆ خۆت بکە پاشان حەج بۆ شبرمە بکە.

٤٤٢ عَن عائشةَ (ض) لا لكِنَّ أفضل الجهادِ حجٌ مبرورٌ

تەرجەمە

٤٤٢ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە دایکی ئیمانداران بە پێغەمبەری گوت باوەڕمان وایە شەڕکردن لەگەڵ کافران خێرترە بۆچی ئەو نەکەین پێغەمبەر (د) فەرمووی بۆ ئێوە یەعنی بۆ ژنان حەجی مەبرور ـ واتە حەجەکی قبوول بوو ـ چاکترە لە جهاد واتە شەڕ لەگەڵ کافران

٤٤٣ عَن أبِي هريرَةَ (ض) مَن حجَّ لِلّهِ فلَمْ يرفُثْ ولَمْ يفسُق رجَعَ كيَوْمِ وَلَدَتْهُ أمُّهُ.

تەرجەمە

٤٤٣ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (خ ل) پێغەمبەر (د.خ) هەر کەسێك حەج بکا بۆ خودا لەگەڵ ژنی خۆشیدا جووت نەبێ (جماع) نەکا وەقسەی جماعیش نەکا لەگەڵ ژنی خۆی جنێوو شەڕەقسەنەکا لەگەڵ هاوڕێو کەسانی تر. دەگەڕێتەوە لە گوناهان بە پاکو خاوێنی وەکوو ئەو ڕۆژەی کە لە دایکی خۆی بووە. (یەعنی ڕۆژی لە دایك بوونی چلۆن پاکە لە هەموو گوناهی مافی خوداو خەلکی تر). ڕۆژی حەجیش ناوا پاکە لە گوناهی بچووك و گەورە.

ترمزی گوتیتی لە نەفسی حقوقی خودا پاك نابێتەوە. یەعنی ئەگەر کەسێك نوێژو کەفارەی لەسەر بێ لێی ساقط نابێ چونکی ئەمانە حقوقن ذنوب نین خولاصە قبوول بوو ـ حەجی مەبرور ـ گوناهی موخالەفە واتا سەر پێچی کردن لە فەرمانی خوا لادەبا حقوقە لا نابا چونکە مخالفەکەی عبارەتە لە تەئخیری واتە دوا خستنی حقوق نەك لەنەفسی حقوق ئینجا بە حەج گوناهی تاخیر دەڕوا بەلام نەفسی حقوق الله دەمێنی ئەبێ بیانکا (ئەوی دیاربێ وایە کەقیاسی مافی خەڵکیش لە مافی خودا بکرێ).

٤٤٤ عَن أبنِ عباس (ض) قالَ إنَّ النبيَّ صلى الله تعالى علَيه وسلم وَقَّتَ لاهلِ المدينةِ ذا الحُلَيفَةِ و لأهل الشام. الحُجُفةُ ولأهلِ نَجدٍ قرنَ المنازلِ ولاهل اليَمَنِ يَلَمْلَمَ.

## تەرجەمە

٤٤٤ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس (خ.ل) گوتی بەراستی پێغەمبەر (د) بۆ خەڵکی مەدینەو ئەوی بەسەر مەدینەدا بچێ بۆ حەج. (ذالحولەیفەی) گێرا بەمیقات و جێگای ئیحرام وەبۆ خەڵکی شامیش (جوحفەی) گێرا بەمیقات بۆ خەڵکی نەجدیش (قرن المنازل) گێرا بەجێگای ئیحرام بۆ خەڵکی یەمەنیش (یلملم)ی گێرا بە میقات و جێگای ئیحرامو نی‌یەت.

٤٤٥ عَن عمر (ض) أتاني الليلَةَ آتٍ مِن رَبِّي فقال صَلِّ في هذا الوادي المباركِ وقُلْ عُمرَةً في حجَّةٍ.

## تەرجەمە

٤٤٥ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عومەر (خ. ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی لەوادی العقیق (لەنزیك) بەقیعە بەینی لەگەڵ مەدینە چوارمیلە). ئێمشەو یەکێك کە جبرەئیل بوو هاتە لام لەلایەن خواوە پێی گوتم نوێژ بکە لەم شێوە پیرۆزە کەوادی (العقیق)ە وە بیشڵێ گێرام عومرەیێك لەحەجێك (یەعنی بەجوتە نی‌یەتی هەردوویان پێکەوە بێنە. وا دەزاندرێ لە پێغەمبەر (د) یاخۆ قارن بووە. باخوێنەمری پێ کراوە بە ئەصحاب بلێ فێرکردنی مەشروعیەتی (قیرانی - واتا نی‌یەتی حەج وعومرە پێکەوە بێنی).

٤٤٦ عَن يَعْلَى ابن أمَيَّةَ (ض) أينَ الَّذي سئَلَ عَنَ العُمرةِ آغسِلْ الطيبَ الذي بِكَ ثلاثَ مَرات وانزع عنك الجُبَّةَ واصنَعْ في عُمرَتِكَ كما تَصنَعُ في حجَّتِكَ.

## تەرجەمە

٤٤٦ دەگێڕنەوە لە یەعلی کوڕی ئومەیە (خ. ل) بە حەزرەتی عومەری گوت پێغەمبەرم لەحاڵی وەحی نیشانبدە. گوتی زۆر پێ نەچوو پیاوێك هات گوتی چی دەفەرمووی لەپیاوێك ئیحرامی بەعومرە بەستووە بەتەواوی خۆیو شمەکی خۆشی لەبێنی خۆش وەرداوە پێغەمبەر (د: سەعاتێك بێ دەنگبوو وەحی هات حەزرەتی عومەر لەئەو ئیشارەتی بوکردم. لەسەر سەری پێغەمبەر سێبەرێك کرابوو. بەجلکێك

منیش بۆزانینی حال وەحی سەری خۆم بردە ناوشمەکەکە دیتم رووی پیرۆزی سوور داگەرابوو. پرخەیەکی لەمەوکی پیرۆزی دەهات لەپاشان وورده وورده هاتەوە سەرخۆی فەرمووی لەکوێیە ئەوی پرسیاری عومرەی کرد. پیاوەکەیان هیناس‌جار پێی گوت شمەکەکەت لەبونە خۆشەکە دا بشۆ جوبەکەشت لەسەر خۆت فرەدە. لەبەر شوینەواری بێنی بەدەنت چلۆن دەبێ بۆحەجی خۆت بۆنی خۆش نەهێلی و جوبەلە بەرکەیەوەو داکەنی دەبی بۆ عومرەشت وابکەی ئەمە دەلیلی تەرکی بێنی خۆشە لەحەجو عومرە

٤٤٧ عن ابن عمر (ض) لَبَّيكَ اللهُمَّ لبَّيك لبَّيكَ لاشريكَ لكَ لَبَّيكَ إنَّ الحمْدَ والنِعمَةَ لَكَ والملكَ لاشريكَ لَكَ.

## تەرجەمە

٤٤٧ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری عومەر (خ.ل) تەلبیەو وەرگرتنی پێغەمبەر (د) ئەمەبوو. دەیفەرموو لبیك اللهم ...هتد واتە من هەمیشە بەردەوامم لەسەر گوێ رایەلیت ئەی خودایە. وە ئەو داوایەی کە بەئیبراهیمت گوت (واذن في الناس بالحج ...هتد.

واتە بەداواکردنی حەج.

(ش) سونەتە بۆ پیاوان دەنگ بلند بکەن بەلام لەگەل ئەوەلی ئیحرام سونەت نییە بەلکی هەرخۆی گوێی لێبی مەکروهە دەنگ بەرزکردن بۆ نافرمتان و بۆ ئەوانەی نەژنو نە مێن) (خنثی) تەلبیە (واتە لبیك اللهم لبیك).

لای شافعی و ئەحمەد سونەتە. لەلای دیکەش واجبە. بەخوێن تۆلەی دەکرێتەوە. لای حەنەفیش ئەگەر گوێت بکرێتەوە لەسەر نیەت بەم تەرزە تەلبیە نەکری احرامەکەی دروستنییە. وەکوو دروست نەبوونی نوێژ بێ‌نییەت و الله اكبر لای مالکیەکانیش گوتویانە ئیحرامەکە نابێ ئەگەر لەگەل نییەتەکە قسەیەك یاکردەوەیەك نەکری تنجا. دەبێ وەکووییەتی هینا یا تەلبیە بکا یاخۆ لەمیقات چەند هەنگاویك بروا یاخەریکی جوولانەوەیەك بێ.

٤٤٨ عن ابن عباس (ض) كأنّي انظرُ اليه اذا انحدر في الوادي يلبّي.

## تەرجەمە

٤٤٨ دەگێڕنەوە لەکوری عەباس (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەما موسی سەلامی خوای لێبی. گوایا ئێستا تەماشای دەکەم بە چاوی خۆم وەکوو شۆڕبۆوە لەوادی ئەزرەق دەڵێ - لبێك ....هتد.

٤٤٩ عن ابي موسى (ض) بِما أهلَلْتَ. هل مَعَكَ مِن هَدْيٍ. قُلتُ لا قلت كأهلالِ النبيّ صلى الله تعالى عليه وسلم.

## تەرجەمە

٤٤٩ دەگێڕنەوە لەئەبو موسی عبدالله‌ی کوری قەیسی ئەشعەری (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د). منی نارد بۆ ناو قەومی خۆم بۆیەمەن پاشان هاتمەوە. ئەو لەبەطحابوو فەرموی بەچی نیەتێك چوویە ناو ئیحرام گوتم بەو نیەتی کەتۆ پێی چوویە ناوئیحرام فەرمووی تۆ هەدیو قوربانی بەنیشانت پێیە ؟ گوتم نا. ئنجا ئەمری پێکردم - سووڕام لەدەورەی بەیت و صەفاو ئیحلال پاشان ئەمری پێکردم بەئیحلال تحللم کرد بۆلای ئافرەتێك چووم لەقەومی خۆم سەری داهینام بەشە یاخۆ سەری شووشتم پاشان حەزرەتی عومەر لەزەمانی خەلافەتی فەرمووی ئێمە کار بەقورئان بکەین بەوەی ئیتمام دەکەینی نەك بەئیحلال. وەکار بەسوننەتی پێغەمبەریش بکەین چونکی ئەو ئیحلالی نەکردووە. لە ئیحرام هەتا هەدیو قوربانی کوشتووتەوە لە - مینا.

٤٥٠ عن عائشةَ (ض) مَن لم يكن مَعَهُ هَديٌ فلأحَبَّ ان يجعلها عُمْرَةً فليفعَلْ. وَمَن كان مَعَهُ الهديُ فلا

## تەرجەمە

٤٥٠ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (خ.ل) لەخزمەت پێغەمبەر (د). دەرکەوتین لەمەدینە بۆحەج لە (سەریف) دابەزین کەدەمیل لەمەکەوە دورە بۆلای ئەصحاب هاتەدەری فەرمووی هەرکەسێکتان هەدیو قوربانی لەگەڵ نەبێ ئەگەر حەزدەکا حەجەکەی بگێڕی بەعومرە بابیکا وەئەوکەسەی هەدیو قوربانیشی لەگەلدایە باوانەکا.

(ش) مەزهەبی مالکو شافعیو ئەبیحەنیفە جەماهیری علەما لەوانیپێشوو

پاشـوو گوتـوويـانـه فەسخی حەج وەبـال عومرە یەعنی هەڵوەشاندنەوەی حەجو وەرگەڕاندنی بەعومرە. بەم تەرزە ئیحرام بەحەج بینی وەپاشان تەحەلولبکا لەحەج بەکردنی عومرە.

ئنجابیبته ـ متمتع ـ تایبەتە بە ئەصحابە (خودا لێ یان خوشبێ). وە تایبەتە بۆ ئەو ساڵەش بونەوەی موخالف بن لەگەڵ ئەحوالی زەمانی پێش ئیسلام کە حەرام بوو لەلایـان عومرە لەمانگەکانی حەج کە شەوالو ذوالقـعدەو دەی ذي الحجەیە. بەڵکی لایان وابوو ئەگەر عومرە لەمانگەکانی حەج بکرابوایە لەگەورەترینی گوناهان بوو. وە ئیمـامی ئەحمـەدو کۆمـەڵیکیش لەئەهلی ظاهر. ئەم تەمەتعو تەحەلولەیان بەموطلەقی تەجویز کردووە. بۆ هەموشیان بەڵگەکانی درێژ درێژیان لەشوێن خۆیان باس کراوون.

٤٥١ عن ابن عباس (ض) حِلٌّ كُلُّهُ قالَهُ لَمّا أمَرَ بالحِلِّ. فقالوا يارسول الله أيّ الحِلِّ

## تـەرجـەمـە

٤٥١ دەگـێڕنـەوە لە کوڕی عەبـاس (خ.ل). گوتی خەڵکی لەپێش ئیسـلام باوەڕیان وابوو کە عومرە لەمانگەکانی حەج لەگەورەترینی گوناهانە لەڕووی عارد. پێغەمبەر (د) بە ئەصحابەوە لەسبەینەی شەوی چواری ذي الحجە گەیشتنە مەکە. بەقیران ـ موهیل و مولەبی‌بوون. واتە دەمیان گوت اللهم لبیك لاشریك لك. واتە داخلی ئیحرام بوون بەحەجو بەعومرەپێغەمبەر (د) فەرمانی پێ کردن حەجەکەی خۆتان بکەن بە عومرە. تەحەلول بکەن بە عەمەلی عومرە. واتە حەج بەتاڵ کەنەوە بە اکتفا کردن بەکـردنی عومرە هەتا بگەڕێن بە موتەمەتیع لەسەر پێچەوانەی ڕای ئیمامی ئەحمـەد لای هەمـوو مەذاهب و عولەما ئەم بەتاڵ کردنەوە تایبەت بوو بەوزەمان هەروەکو لەحەدیثی پێش ئەمە ڕەت بوو ئەم فەرمانەی پێغەمبەریان زۆر لەلا گەورە بوو. چونکە لایان وابوو عومرە لەمانگو ڕۆژەکانی حەجی‌یان لەگەورەترینی گوناهانە. گوتیان یارسول الله چەحەلال کردنێك مەبەستە چونکە ئەوان حەجیان لا حەرام بوو لایان وابوو دوو تەحەلول هەیە فەرمووی ئەم حەلال کردنەم مەبەستە حەلالە هەرچی لەسەر ئەوی ئیحرامی گرتووە بەحەج حەرام بێ. هەتا جووت بوون (جماع) لەگەڵ ئافرەتیش.

٤٥٢ عن حفصَةَ (ض) إنّي لَبَّدْتُ رأسي وَقَلَّدْتُ هَدْيِي فلاأحِلُّ حتّى أنحَر.

## تەرجەمە

٤٥٢ دەگێڕنەوە لەحەفصەی دایکی ئیماندارات (خ.ل). گوتی ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی هەرکەسێك نیەتی حەجی گۆڕی بەعومرە لە ئیحرام دەرچوون. تۆبۆچی وەکوو ئەوان ئەم تەحلیلەت نەکرد فەرمووی من مووەکانی سەری خۆم تەلبیدکردووە واتە بەشتێکی وەکوو صەمغ پێکم وەنووساندووە ئەسپێ ناچێتە ناوی. قەرێتە شم بە نیشان لەملی قوربانی خستووە هەتا لە (مینا) ئەم هەدیو قوربانییە نەکوژمەوە لەئیحرام ناچمە دەرێ.

(ش) ئیمامی ئەعزەم لەم حەدیثانەی پێشەوە وای بۆ چووە پێغەمبەر (د) بەنیەتی (حەجی قیران) چوویتە ئیحرام بۆیێ باشترینی ئیحرام حەجی قیرانە لە پاش ئەو تەمەتوعە لەپاش. ئەو حەجی ئیفرادە بەلام لای ئیمامی شافعیو مالك پێغەمبەر (د) تەنیا بۆ حەج چۆیتە ناو ئیحرام یاخود لە ئەولەوە بۆ حەج داخلی ئەحیرام بووە پاشان عومرەشی ئیدخال کردووە. (خستوویەتیە سەر حەج). بۆیی چاکترینی ئیحرام حەجی ئیفرادە پاشان (تەمەتوعە) واتە تەنیا بەعومرە داخلی ئیحرام بوونە پاشان حەجی قیرانە. لای ئیمامی ئەحمەدیش بە گوێرەی ظاهری ئەم حەدیثی حەفصە پێغەمبەر (د) تەنیا بە (تەمەتوع) یەعنی بە نیەتی عومرە داخلی ئیحرام بوو بێ هەدیو قوربانیشی لەسەرەتاوە ناردبوو بۆیە لە هەمووی چاکتر (تەمەتو عە) یەعنی داخلی ئیحرام بوونە بۆعومرە لە صورەتی سەوقی هەدی. حەجی قیران باشترینیانە.

(یەکێکی تریش لای ئیمامی ئەعزەم کەسێك لەمانگی حەج تەنیا بەنیەتی عومرە داخلی ئیحرام بێ قوربانی تەمەتوع لازمە کەسێکیش بۆحەجی قیران موەفەق بووبێ قوربانی شوکر پێویستە کەسێکیش تەنیا بۆ حەج داخلی ئیحرام بووبێ بەرای هەموو لایەك هیچی لەسەر پێویست نیە. بەلام دەبێ لەپاش حەجی عومرە بکا لای ئیمامی ئەعزەم و ئیمامی مالك لەسەر قسەی باوەرپێکراو عومرەسونەتی مۆکەدەیە ئەفەرزە ئەواجبە لای ئیمامی شافعیو ئیمامی ئەحمەد وەکو حەج فەرزی عەینە

٤٥٣ عَن جابر (ض) احِلّوا من إحرامكم بطواف البيتِ وَ بينَ الصفا والمروَة وقصِّروا ثم أقيمواحلالاً حتى إذاكانَ يومَ التَرْوِيَة فأهِلّوا بالحجّ واجعلوا التي قدمتم بهامتعَةً فقالوا كيفَ نجعلُها مُتعَةً وَقَدْ سمَّينا الحجَّ فقال افعلوا ماأمَرْتكم فلولا أنّي سُقْتُ الهدْيَ لَفعلْتُ مِثلَ الذي آمَرْتكمُ ولكن لايحلّ مِنى حَرامٌ حتّى يبلُغ الهديُ محِلّهُ

## تەرجەمە

٤٥٣ دەگێڕنەوە لەجابر (ض) گوتی لەسالی حجة الوداع ئێمە لەخدمەت

پێغەمبەر دابووڕین داخلی ئیحرام بووین پاشان پێغەمبەر (د) بە ئێمەی گوت حەجی خۆتان بەعومرە بگۆڕنەوە. طه واف بەیت بکەن وە سەعی صەفاو مەروە بکەن بەهەڵقاهێنی سەرتان لە ئیحرامی خۆتان بچۆنە دەرەوە. پاشان بەم تەرزە بەحەلالو ئیحرامی دەوام بکەن هەتا ڕۆژی (تەرویە) کە ڕۆژی هەشتەمی ذي الحجەیە دووبارە بەنیەتی حەج داخلی ئیحرام بن. ئەو حەجی ئیفرادی کە لەپێشدا کردتان بیگۆڕنەوە بەعومرەو تەمەتوع پاشان هەندێ ئەصحاب گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا چلۆن بیکەینە موتعە. ئێمە لەنیەتی پێشوو ناوی حەجمان هێنا پێغەمبەر (د) فەرمووی من چیتان ئەمرپێ دەکەم وابکەن منیش ئەگەر هەدیو قوربانیم لەپێشدا نەکردبایە وەکوو ئەو ئەمری بەئێوە دەکەم وام دەکرد. بەلام حەڵاڵ نابێ بۆمن هیچ شتێك لەوەی لەئیحرام قەدەغەکراوە هەتا هەدیو قوربانیم نەگاتە شوێنی خۆی کە مینایە وە نەکوژرێتەوە.

٤٥٤ عَن عائشةَ (ض) نعم. ان قومَكِ قصرَت بهمُ النفقةُ. قُلتُ فما شأنُ بابه مُرتفِعاً قال فَعَلَ ذلكَ قومُكِ ليُدخِلوا مَن شاؤا. ويمنعُوا مَن شاءوا. ولولا انُ قومكِ حديثُ عهدُ بالجاهليةِ. فأخافُ أن تنكِرَ قلوبُهُم أن أدخِلَ الجدُرَ في البيتِ وأن الصقَ بابهُ بالارض.

## تەرجەمە

٤٥٤ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە گوتی پرسیم لە پێغەمبەر (د) ئەری دیوارەکانی حجری اسماعیل لەبەیتە فەرمووی بەلێ لەبەیتە گوتم ئەدی بۆچی نەیان خستە ناو بەیت (واتە کەعبە). فەرمووی قەومەکەت لە دارایی و پارە دەستیان کورت بوو پێیان نەکرا تەواوی بکەن. گوتم ئەدی بۆچی دەرگەی ئەمەندە لە بلندە فەرمووی قەومی تۆ وایان لێکرد. هەتا هەرکەسی بەخۆیان هەوەسیان لێبێ بیبەنە ژوورێ. ئەوی هەوەسیشیان لێ نەبێ مەنعی بکەن لێ نەگەرێن بچێتە ژووری وە ئەگەر لەبەر قەومی تۆ نەبوایە کە لەمێژنییە هاتینە ناو دینی ئیسلام وە لەکوفر دەرچوونەو ترسم لێیان هەیە ئینکارەکیان دەرحەق بەمن پەیدا ببێ.
دیوارەکانی حجری اسماعیلم داخلی بەیت دەکرد دەرگەی بەیتیشم بەعاردەوە دەنووساند هەندێ لەزانایان گوتوویانە ئەوی پێغەمبەر لێ دەترسا ئەمەبوو ئەوەك نسبەتی بدەن وەبال انفراد بە فەخر. کەچی فەخرو شەرەف بەیت گشتییە بۆ هەموانە بۆ هەموو خەڵکی (مەکە) ئەمە دەلیلە لەسەر دروست بوونی یەك لەدوو شتان کە هەردوویان زیانی تیابێ ئەوەی کە زیانی کەمترە. بۆ ئەوەی تووشی زیانە گەورەکە

نەبن. چونكی قصوری بەیت زیانە كەمەكەیانە لەوەی كۆمەڵێك لەموسوڵمانان بگەڕێنەوە لە ئاینی ئیسلام بۆ كافربوون

٤٥٥ وفي روايةٍ عن عائشةَ (ض) يا عائشةُ لولا انَّ قومَكِ حديثُ عهدٍ بجاهلية لأمرتُ بالبيتِ فهُدِمَ فأدخلتُ فيه ما اُخرِجَ مِنهُ وَالزقتهُ بالارضِ وجعلتُ له بابينِ باباً شرقياً وباباً غربياً فبلغتُ به اساسَ إبراهيم.

## تەرجەمە

٤٥٥ جارێكی تریش لە عائشە دەگێڕنەوە (خ ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی عائشە ئەگەر لەبەر قەومی تۆ نەبوایە كە لەمێژنی‌یە موسوڵمان بووینە. ئەمرم دەكرد بۆ مەبەستی ئاوەدان كردنەوە. كەعبەی پیرۆز خراپ بكرایە ئەو جێگایەكی بەیت بووە لە زەمانی ابراهیم كە داخلی بەیت نەكرایە دەمم خستە ناو بەیت. وە دەرگەشم بەعەردەوە دەنووساند دوو دەرگەشم لێ دەهێشتەوە دەرگەكیان بەرەو ڕۆژهەلات بی وەكوو ئیستا دەرگەكیشیان بەرەو ڕۆژئاوا بەرامبەر یەكتری. هەتا لەم دەرگە بێنە ژوورێ بەویتر بچنە دەرێ وە دیوارەكانیشم لەسەر بناغەی دیواری ابراهیم دادەمەزراند.
لە موعجەمی قورئان لە جزئی (٢) ص (١١٩) دەڵێ. بەڕاستی پێغەمبەر (د) تەمەنی (٣٥) ساڵی بوو قورەیش كەعبەیان لەسەر غەیری قەواعدی ابراهیم دروست كردەوە بەلام لە مێژووی (٦٣) كۆچی عبداللەی كوڕی زوبەیر بنایەكەی تێكدا دووبارە لەسەر بناغەی ئیبراهیمی دروست كردەوە وە بەرزایشی كردە (١٧) مەتر. كە پێشانیش (١٥) مەتر بوو. درێژایی لای سوولاوكەو لای بەرامبەری دەمەترو دەیەكی مەترێك بوو. درێژایی لای دەرگەشیو لای بەرامبەری (١٢) مەتر بوو لە ١٧ رجب ساڵی ٦٤ كۆچی تەواوی كرد.
پاشان حەجاج هات تێكیدا لەسەر بناغەی قورەیشی‌یەكان دروستی كردەوە لای باكوریشی بەرز نەكردەوە هەتا شەش گەزو بستێكی دوا نەخست. ئنجا شوێنەواری ئەم كەمی‌یە لە كەعبە بەمەحطومی یەعنی بەجودایی مایەوە وەبۆیە پێی دەڵێن حەطیم.

٤٥٦ عَن أسامَةَ بن زيدٍ (ض) وَهَلْ تَرَكَ عَقيلٌ مَن رِباعٍ أو دورٍ.

## تەرجەمە

٤٥٦ پێغەمبەر (د) تەشریفی بۆمەکە دەچوو. لەرێ قوناغێك مابوو بگەنە مەکە ئوسامەی کوری زەید بە پێغەمبەری گوت سبەینێ وەکوو گەیشتینە مەکە لە خانوەکانی تۆدا دادەبەزین. لەکوێ دادەبەزین پرسیاری لێکرد. پێغەمبەر فەرمووی ـ عەقیل چماهێچی لە ملکەکان و خانوەکانی ئێمە بۆ ئێمە هێشت دەستی بەسەر هەموو داگرتووە. بەهەوەسی خۆی بەکاریان دەهێنی. چونکە عقیل کەبرای گەورەتربوو لە (عەلی) هێشتا خۆیو طالبی برای مسلمان نەبوبون. (عەلی) و (جەعفەری طەیار مسلمان بوبون ئنجا لە پاش کۆچی دوایی ابو طالب کورەکانی موسولمانی میراتیان لێ نەگرت ئنجا هەرچەند ملکی ئەبو طالب هەبوو (ناوی عبدالمناف بوو) بۆ کورەکانی کافر ماوە. کە طالب و عەقیل بوون طالبیش لە غەزای بەدر نەزانرا چی بەسەرهات ئنجا هەر ملکێکی پێغەمبەر (د) لە عبداللەی باوکی بە میرات بۆی مابوو لەگەڵ ئەملاکی ئەبو طالب هەمووی بۆ عەقیل مایەوە بەبونەی خزمایەتی هەمووی زەفت کرد لە پاش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە هەموویشی فرۆشت. لای هەندەکان بۆ مندالەکانی عەقیل مایەوە. مندالەکانی ملکەکانیان بەسەد هەزار [١٠٠٠٠٠] دینار فرۆشتە محمدی کوری یوسفی برای حەجاجی کوری یوسفی.

(ش) ئیمامی شافعی لەم حەدیثەی وەرگرتووە ئەملاك و خانووی مەکە دروستە فرۆشتن و کرین و بەکرێ دان و بەکرێ گرتنی و بەمیرات گرتنیان.

٤٥٧ عن أبي هريرةَ. منزِلنا غداً ان شاء الله تعالىٰ بخيفِ بني كنانةَ حيثُ تقاسموا على الكفر.

## تەرجەمە

٤٥٧ دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی پاش گەرانەوەی لە میناو ویستی بچیتە مەکە قوناغمان سبەی خەیفی بەنی کنانەیە ـ ئەگەر خواحەز بکات ئەو جێگایەی کەبەنی کنانەو قورەیش لەوێ کۆبوونەوە. بوونە سوێند خۆر بۆ یەکتری کەدەوام بکەن لەسەر کفرو باوەرنەهێنان و عەداوەتی بەنی هاشم و بەنی مطلبی.

بەم تەرزە ژنیان لێ نەهێنن ژنیان نەدەنێ وە هیچ کرین و فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەن هەتا پێغەمبەریان تەسلیم نەکەن [خەیف ئەورێکە لە چیا هاتوتە خوارێ لافاو نایگرێ لەبەر بەرزی) ئنجا قورەیش لەسەر عەداوەتی بەنی هاشم و بەنی مطلب

سەنەدێکیان نووسیبوو لەلای ژوورەوە بەدیواری کەعبەیانەوە نووساندبوو بەناچاری پێغەمبەر بەخۆیو بە چەند کەسانی باوەڕیان پێ هێنابوو.

سێ ساڵ - بەتەمای خودای گەورە. لە دەرەوەی مەکە لەشیعبی ئەبو طالب بۆ ئەوەی کە خودا لێیان رازی بی دەوامیان کرد پاشان پێنج کەس لە گەورەکانی قورەیش وەکوو

١- هشامی کوڕی عەمرو ٢- زوهەیری کوڕی ئەبی ئومیەو عاتکەی دایکی. کە ئەویش کچی عبدالمطلب بوو زەمعەی کوڕی ئەسوەد وە مطعمی کوڕی عودەی و ابو البختری کوڕی هشام.

گوتیان ئێمە ئەم پەیمانە تێك دەدەین مەطعەم کوڕی عودەی هەلستا بەرق چوو لاپەرەکەی ئەم پەیمانەی لێ نووسراوە بدرێنی چوو لاپەرەکەی لەدیواری کەعبە بچران وەکوو دیتییان کلمەیەك لە لاپەرەکە نەمابوو ئایا چی حەیوانێك خواردبووی. غەیری ووشەی (الله) ئەبێ مابوو. پێغەمبەر (د) بەخۆی و نیماندارانی خزمەت خۆی لەشیعب هاتنەوە مەکە. بەسەربەستی.

بەلام گەورەترین محققەکانی ئەم چەرخە محمد حسین هەیکەل لە (حەیاتی محمد ص١٧٩)

دەڵێ: ئەسبابی تێك دانی ئەم لاپەرەیە ئەمە بوو. دەوامی ناخۆشیو ئەزیەتی باوەڕداران. بەهۆی مانەوەیان بەتەنیا کارێکی زۆری کردە ناودڵی هەندێ لە قورەیشیان چونکە هەردوولا خزم و کەسی یەکتر بوون یەك لەوان کەهشامی کوڕی عەمربوو لە هەموویان زیاتر موتە ئەثیر بوو هەتا لە نیوەی شەو بەدزی قورە یشیان ووشتریان لەزادو زەخیرە بار دەکردو دەی برد هەتا دەم شیعبی ابو طالب لغاوی لەسەری ووشتر دەکردەوە شوورێکی لە تەنگەی ووشتر دەدا دەچووە لای نیمانداران - زەخیرەکەیان لێ دەگێڕاوە ووشتریان دەناردەوە پاشان چووە لای زوهەیر کەلەکچی عبدالمطلب بوو گوتی تۆ رازی خواردن بخۆی جلکی باش لەبەربکەی لای ژنی خۆت بخەوی خالوانی تۆش و خزم و کەسەکانمان. لەمانە بێبەش بن و والله ئەگەر ئەمانە خالوانی ابو الحکم کوڕی هشامی بوونایە لە تۆم قبوول نەدەکرد لەو عەزابە داین هەرسوویان پەیمانیان بەست لەسەر تێکدانی ئەم لاپەرەیە. بە پەیداکردنی هەندێ هاوڕێی تریش مەطعەمی کوڕی عودەی وە ابو البختریو زەمعە هەر پێنجیان رێك کەوتن لەسەر تێکدانی لاپەرە. زوهەیری کوڕی ئومەیە چوو حەوت جار طەواف بەیتی کرد. پاشان بەدەنگێکی بەرز بانگی کرد. ئەی خەڵکی مەکە ئەرێ ئێمە خواردن بخۆین جلك لەبەر بکەین بەنی هاشمیش لە رووتیان و لەبرسان

بمرن والله دانانیشم ههتا ئهم سهنهده نهدرینم. ئهبوو جههل گوئ‌ی لیٔ بوو گوتی درۆ دهکهی والله نایدرینی زهمعهو ابو البختری و مهطعهم و هشام دهنگیان لیٔدا گوتیان تۆ درۆدهکهی زوههیر راست دهکا. ئهبوو جههل تیٔگهیشت ئهمه تهدبیرهکه بهشهو کراوهو براوهتهوه. هیچی لهگهلٔ ریٔك کهوتنی خهلٔك بیٔ ناکریٔ مهطعهم چوو لاپهره بدرینی دیتی مۆرانه خواردوویه ئهمهنده نهبیٔ (باسمك اللهم) واته بهناوت خودایــه لهســهرهوهی سهنهد نووسرابوو ئنجا بهم تهرزه ریٔگه کراوه بۆ پیٔغهمبهرو یارانی که بیٔنهوه مهکه. وه ههردوو لایهنهکهش کرین و فرۆشتن لهگهلٔ یهکدا بکهن.
(حیاة محمد ص١٧٩ الطبعة الاولی)

ئهگــهر چی بهســهربــهستی دهگــهران بهلاّم قورهیش دهستیــیان کردهوه به ئازاردانی موسولٔمانان بهلاّم له دوایی بۆ کۆچ کردن فهرمانی خودایی هات. کۆچیان کرد بۆ مهدینه له زولٔم و جهوری قورهیش سانهوه. ههتا له دوایی پاش گرتنی مهکه لهلایهن مسلمانان بهیهکجاری استراحهتییان کرد.

٤٥٨ عن أبي هريرةَ (ض) يُخربُ الكعْبةَ ذووالسويقين مِن الحبَشَةِ.

## تهرجهمه

٤٥٨ دهگیٔرنهوه له ئهبوو هورهیره (خ.ل) پیٔغهمبهر (د) فهرمووی کهعبه خراب دهکا یهکیٔکی دوو لاق باریکی حهبهشه (یهعنی یهکیٔکی لاوازی بیٔ دهستهلاٌت له خهلٔکی حهبهشه ئهمه وه نهبیٔ یهك نهگرتهوه له گهل ئایهتی اولم یروا انا جعلنا حرماً آمناً) چونکی (آمِنٌ) تا نزیکی قیامهتهو خرابی دونیایه ئهو کاته (ذو السویقین) دیٔ.

٤٥٩ عن عائشة (ض) مَن شاءَ ان يَصومَهُ فليَصُمْهُ وَ من شاءَ ان يتركهُ فليتركهُ.

## تهرجهمه

٤٥٩ دهگیٔرنهوه له حهزرهتی عائشه (ض) گوتی هاوریٔکانی پیٔغهمبهر (د) رۆژی عاشورا یهعنی دهی موحهرهم به رۆژوو دهبوون له پیٔش واجب بوونی رهمهزان پاشــان وهکوو رهمهزان فهرز کرا پیٔغهمبهر (د) فهرمووی ههر کهسی حهز دهکا به رۆژووبیٔ ههر کهس حهزیش دهکا بابه رۆژوو نهبیٔ.
(ش) وا نیٔیه رهمهزان عاشورای ئهمنیشبیٔ چونکی عاشورا واجب نهبووه ئهگهر چی زاناکانی علمی ئصولیش دهی گیٔرن به مثال بۆ نهسخ به بهدهلی گرانتر.

٤٦٠ عن أبي سعيد (ض) ليُحْجَجَنّ البيتُ و ليُعمرنْ بعدَ خروج يأجوج و مأجوج (و عن شُعْبَةَ). لا تقوم السّاعَةُ حتّى لا يُحَجّ البيْتُ و الاولُ اكثرُ.

## تەرجەمە

٤٦٠ دەگێڕنەوە لە ئەبی سەعیدی خودری (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی بە بێ شك قەصدی کەعبە دەکرێ بۆ بە جێ گەیاندنی حەج عومرەش دەکرێ لە پاش دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج لە شەرقاوی ئەگەر چی دەفەرمووی یەئجوج و مەئجوج دوو ناوی عەرەبی نین بەڵام لای هەندێ زانایانی ئەم چەرخە دەڵێن ئەم دوو لەفظە لە ئەجیجن یەعنی بلیسەی ئاگر کە دەکا میلەتێکی وا ئیش و کارو پیشەسازی سەیرو سەر سورهێنەری میکانیکی راوەستاوە لە سەر ئەو ئاگرەی ناو مەخزەنێکە کە بە زمانی بیگانە پێی دەڵێن (کەوەر) کەوەریش دەیخاتە مەخزەنێکی تر کە پێی دەڵێن (گزۆز) گزۆزیش ئەیکا بە دووکەڵ و فرێدەداتە دەرەوە روایەتی شعبەشم ئەنووسی چونکی کەمترە.

٤٦١ عن ابن عباس (ض) كأنّي أسوَدَ أفْجَجَ يقلعها حَجَراً حَجَراً.

## تەرجەمە

٤٦١
دەگێڕنەوە لە کوری عەباس (خ.ل). پێغەمبەر (د) فەرمووی گۆیا بە چاوی خۆم دەبینم یەکێکی رەشی قاچ خواری ـ واتە بەینی پاژنەکانی فرەوان و بەینی سەرپەنجەکانی لێك نزیك) کەعبە خراب دەکا بەردەکانی یەك یەك هەڵدەقەنێ ئەمە ئەم حەدیثەی لە ئەبوو هورەیرە دەگێڕنەوە بەهێز دەکا کەلە ژمارە (٤٥٥) خراب کرانی کەعبە لە پاش هاتنە خوارەوەی عیسایەو لە پاش رەفعی قورئانە لە قورطبی وا دەڵێ

٤٦٢ عن ابن عباس (ض) قاتلهُمُ اللّهُ أما وَ اللّهِ قد علموا أنّهما لَمْ يستقسِما بها قطّ.

## تەرجەمە

٤٦٢ دەگێڕنەوە لە کوری عەباس (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) وەکوو چووە مەکە نەچووە ناو (بەیت) بوتێشی لە ناو بێ فەرمانی دا بوتەکانیان هێنا دەرێ لەوانەش وێنەی اسماعیل و ابراهیم بوو باسکە تیری فالیان بە دەستەوە بوو. پێغەمبەر (د)

فەرمووی لەعنەتی خودایان لێبی ئاگادار بە واللە بە بێ شك دەزانن کە ابراهیم و اسماعیل داوای زانینی ئەو بەشەیان نەکردووە کە لە ئەزەل داندراوە بە بلسکە تیری فال هیچ کاتێك.

٤٦٣ عن ابن عباس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه و سلم. قُلهُ بيدِهِ.

تەرجەمە

٤٦٣ دەگێڕنەوە لە عبدالله کوری عەباس (خ. ل) پێغەمبەر (د) لە دەورەی کەعبە دەسووڕا دیتی یەکێك داوێکی لە دەست کوێرمیەکی خستووە رای دەکێشی. بە دەستی پیرۆزی داوەکەی بری فەرمووی بە دەست رای کێشە چونکە راکێشانی بەداو لە بۆ ئاژەڵ هاتووە.

٤٦٤ عن ابن عباس (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه و سلم - إسقني. إسقني أعملوا فانكم على عمل صالح لو لا أنْ تُغلبوا لَنَزلْتُ الحَبْلَ على هذه أي عاتقِهِ.

تەرجەمە

٤٦٤ دەگێڕنەوە لە کوری عەباس پێغەمبەر (د) لە کاتی حەج کردن هاتە شوێنی ئاو خواردنەوە غەیری زەمزەم . ئاوەکەش بۆ ئەوەی شیرین بێ میوژیان تێ خستبوو داوای ئاوی کرد عەباس مامیشی گوتی ئەی فەضل بە ئازایی بچۆ لای دایکت (کە ناوی لوبابەی کچی حارثی هلالیە) لەو شەربەتی بە تام و خاوێنی ماڵی خۆمان بۆ پێغەمبەر (د) بنێری ئەم شەربەتەی ئێرە زۆر دەستیان تێوەر داوە پێغەمبەر بۆ رێ نیشاندانی خەلکی هەتا بزانن ئەصل لە هەموو شت خاوێنیە هەتا پیسیەکەی بە دیار دەکەوێ فەرمووی لەم شەربەتە بەدەرێ ئنجا لەو شەربەتی خواردەوە. پاشان چووە سەر بیری زەمزەم دیتی ئاویان لێ هەڵدەهێنجا دەیاندا بە حەجاج.

بە کرێکارەکانی فەرموو ئێشی تیا بکەن ئێوە لە سەر کاری خێرن ئەگەر لە بەر ئێوە نەبوایە ئەوەك عالەم قەلەبالغیتان لە سەر بکەن. کە ببینن من ئێشی تیا دەکەم لە ویشترەکەی خۆم دادەبەزیم بۆ راکێشانی ئاو گوریسەکەم دەخستە سەر شانی خۆم (ش) لەم حەدیثە پیرۆزە پیشانمان دەدا کە ئاودان بۆ هەموو کەسە و گشتیە وەکو ئاو لە بیر دەرهێنان یان لە سارنج یان کانی دەولەمەندو هەژار دروستە لێی بخواتەوە

مەگەر بە نەصی حەدیث یا ئایەت دەولەمەندی لێ هاتبیتە دەرێ. چونکی پێغەمبەر لەو شەربەتی سەبیلی خواردەوەو کە خواردنەوەکی گشتی بوو صەدەقەشی بۆ حەلال نەبوو ئنجا ئەم شوێنانە بۆ ئاو خواردنەوەی هەموو کەس داندراون بۆ کەلکی گشتی ئنجا بۆ دەولەمەندیش هەدیەیە. بۆ هەژار صەدەقەیە ئیشارەتیش هەیە وە بال ئەوەی نابێ بێز لە خواردنەوەی ئاو بکرێتەوە لەم جۆرە شوێنانە.

٤٦٥ عن جابرٍ (ض) لو استقبلْتُ مِن أمري ما استدبَرْتُ ما اهديْتُ و لو لا أنَّ معي الهدْي لأحللْتُ.

## تەرجەمە

٤٦٥ دەگێڕنەوە لە جابر (خ. ل) گوتی پێغەمبەر (د) لە گەل یارانی بە نیەتی حەج گوتیان (الله اکبر) یەعنی چوونە ئیحرام لو گەل یەکیکیشیان هەدیەو قوربانی نەبوو. تەنیا پێغەمبەرو طلحە نەبێ حەزرەتی علیش لە یەمەنەوە گەیشتە ئەوێ هەدیەو قوربانی لە گەل بوو. پێغەمبەر لێی پرسی بە چی (ئیهلالت) کردووە. یەعنی بە چی نیەتێك چوویە ئاو ئیحرام وەلامی داوە بە ئیهلالی پێغەمبەر ئیهلالم کردووە ئنجا فەرمانی کردە یارانی خۆی فەرمووی فەسخ بکەن حەجەکەیان بە عومرە (یەعنی حەجەکە یان بگۆڕن بە عومرە) طەوافی بەیتی پیرۆز بکەن و لە نێوان صەفاو مروە سەعی بکەن ـ واتە برۆن بە سەر مەغار ـ پاشان موویان بقرتێنن لە ئیحرام دەچنە دەرێ دەبن بە (حەلال) مەگەر ئەو کەسە نەبێ هەدیەو قوربانی پێ بێ. یارانی پێغەمبەر ئەم قسەیان پێ ناخۆش بوو چونکی ئیحرامی پێغەمبەر و یارانی بگۆڕنەوە بە عومرەو مخالف بێ لە گەل ئیحرامی پێغەمبەر (د) ئنجا ئەصحاب گوتیان بۆیی ئیحرامی حەج بگۆڕین بە عومرە هەتا (جماعان) بکەین (واتە لە گەل ژنەکانمان جووت بین). ئێمە ئەمەندە لە مێژ نی یە لە جووت بوون لەگەل ژنەکانمان دوور کەوتینەوە ئالەتمان شەهوەتی لێ دەچکێتەوە ئنجا لە بەر چاك کردنەوەی دلی ئەوان پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر من ئەم حالەم بزانیبوایە کە ئێوە ئەمەندە پێتان نلخۆشە کە حەج بە عومرە بگۆڕنەوە هەر لە سەرەتاوە لە میقات وەکوو داخلی ئیحرام بووم هەدیەو قوربانیم نەدەنارد ئێستاش ئەگەر من قوربانی و هەدیم لە گەل نەبوایە ئیحلالم دەکرد یەعنی فەسخی حەجم دەکرد داخلی ئیحرام دەبووم بە عومرە بەلام هەبوونی قوربانی مانعە بۆ گۆڕینی حەج بە عومرە.

٤٦٦ عن ابن عباس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه و سلم . ايها الناس عليكم بالسكينة فان البرّ ليس بالايضاع .

## تەرجەمە

٤٦٦ دەگێڕنەوە لە کوڕی عەباسی (خ. ل) ڕۆژی عەرەفە لای پێغەمبەر بووین . پێغەمبەر (د) لە لای پشتەوە گوێی لە دەنگە دەنگێکی زۆر بوو خەریك بوون بە ئازاری ووشتریان لێ دەخورین شوورە دارێکی بەدەستەوە بوو. بە شوورەکە نیشارەی بۆ کردن. فەرمووی تالووکە مەکەن لە ڕۆیشتن لە سەر خۆبن چونکی خێرو چاکە بە پەلە پەلی و خۆش ڕۆیشتن نی‌یە.

٤٦٧ عن عبدالله (ض) انّ هاتين الصّلاتين حُوّلتا عن وقتيهما في هذا المكان المغربَ و العِشاءَ فلا يَقْدَمُ الناسُ جمعاً حتّى يُعتِموا وَ صلاةُ الفجرِ هذه السّاعَةَ .

## تەرجەمە

٤٦٧ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی مەسعود (خ. ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی بە ڕاستی لە موزدەلیفە ئەم دوو نوێژی مەغرب و عیشا کاتی ئاسایی‌و دیار کراوی ئەوان گۆڕاوە ئنجا با کەس لە عەرەفات نەیێتە موزدەلیفە هەتا نوێژی عیشا دەبی وە تاریك دادێ. نوێژی بەیانیش لەو کاتە بە جێ دەکەیەنوێ (واتە لە پاش بە دیارکەوتنی بەیانی (فەجر) بەم تەرزە بڵێن بەیانی نەداوە)
لای ئیمامی ئەعزەم کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەسر تایبەتە بە عەرەفات و موزدەلیفە بەم تەرزە نوێژی عەسرو نیوەڕۆ هەریەك دوو ڕکعەت بە کورت کردنەوەو کۆکردنەوە (قصر و الجمع) لە کاتی نیوەڕۆ (واتە بە کۆ کردنەوەی پێش خستن (قصر التقديم) دەکرێ نوێژی مەغرب و عیشاش لە موزدەلیفە لە کاتی عیشا بە کۆکردنەوەو کورت کردنەوەی دوایی دەکرێ (یەعنی جمع التاخیر) لای ئیمامی شافیعیش ڕەحمەتی خوای لێ بی هەر کەس سەفەری بێ لە هەموو کاتێك بۆی هەیە نوێژی نیوەڕۆو عەسر ـ بە کۆکردنەوەی پێش خستن (جمع التقديم) بکەن یان بە جمع التاخير)

٤٦٨ عن أبي هريرةَ (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه و سلم . إركبهاإركبها ويلك يعني البُدنَةَ .

## تەرجەمە

٤٦٨ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (خ. ل) پێغەمبەر (د) پیاوێکی دیت ووشتری هەدیو قوربانی رادەکێشا خۆی بە پیادە دەرۆیشت پێغەمبەر (د) فەرمووی سواری بە پیاوەکە گوتی هەدیە دووبارە فەرمووی سواری بە پیاوەکە گوتی هەدیو قوربانی‌یە فەرمووی جاری سێیەم سواری بە ئەی واوەیلاو مەشەقەت بۆ تۆ (ش) لە کاتی پێویست و بە رێک کەوتنی هەموو مەزهەبەکان دروستە سواری ووشتری قوربانی و هەدی ببی بەلام ئەگەر پێویست نەبێ و ناچار نەبی لای ئیمامی ئەعزەم دروست نی‌یە سواری ببی لای هەندێ مەزهەبیش بە تەواوی دروستە سواری ببی.

٤٦٩ عن إبن عمر (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه و سلم مَن كان منكم أهدى فانَّهُ لا يَحِلُّ لِشَىءٍ حَرُمَ مِنهُ حتى يقضي حجَّهُ وَ من لم يكن منكُمْ أهدى فليطُفْ بالبيت و بالصَّفا و المروةِ و ليقصرْ وليحْلِلْ ثمَّ لِيُهِلَّ بالحجِّ فمن لم يجدْ هَدْياً فليصُمْ ثلاثَةَ أيّامٍ في الحجِّ و سبعةً إذا رَجَعَ لأهْلِهِ.

## تەرجەمە

٤٦٩ دەگێڕنەوە لە کوڕی عومەر (خ. ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی لە حجة الوداع ئەی ئەصحابی من هەر کەسێک هەدیو قوربانی ناردووە تا حەجی خۆی تەواو نەکا لە کاتی ئیحرام بۆی حەلال نابێ ئەوشتی لێی حەرام کراوە لە کاتی ئیحرام یەعنی لە ئیحرام دەرناچی وە هەر کەسێکیش لە ئێوە هەدیو قوربانی سەوق نەکردووە حەجی خۆی بگۆڕێتەوە بە عومرە ( بەیت)ی پیرۆز طەواف بکا لە بەینی صەفاو مەروە بێ و بچێ و موو هەل بقاچی و لە ئیحرام دەربچی لە پاشان کاتەکی چووە سەر کێوی (عەرەفات) بۆ حەج نی‌یەت بینی و بچیتە ناو ئیحرام. بەلام لە جیاتی ئەو هەدیو قوربانی کە بەشەرع لازمە بۆ تەمەتوع.

پارەی ئەبوو قوربانی پێ بکرێ پێویستە دەبی (١٠) دە رۆژ بە رۆژوو ببی سێ رۆژ لە پاش ئیحرامی حەج لە رۆژی شەشەمینی ذی الحجة پاشان حەوتیش وەکوو گەیشتە نیشتمانی خۆیو مالی خۆی نەک لە رێگا یەعنی لە رۆژی حەوتەمین و هەشتەمین و نۆیەمین لە حەج بە رۆژوو ببی حەوتەکەی تریش لە مالی خۆی بەم رۆژووانە دەلێن رۆژووی (تەمەتوع).

• گۆڕینی حەج بە عومرە. لە کاتی حەج کردن لە بەر ئەوە دروستە چونکە

مەبەستەدەی تەشریعی بوو بۆ دانانی یاسایەك بوو چونکی لە زەمانی پێش ئیسلام عومرە لە غەیری مانگەکانی حەج نەبوایە نەدەکرا.
هەتــا (ســوراقە) (خ.ل) گوتی ئەی پێغەمبەری خودای ئەم گۆڕینە تایبەتە بە ئیمسال یا بەنێوە. پێغەمبەر (د) فەرمووی.
(لابل للابد ـ نابەلکوو بۆ هەتا هەتایە).

٤٧٠ عن جابر (ض) كُلوا وتَزوَّدوا يعني من لحوم البُدْنِ).

## تەرجەمە

٤٧٠ دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری (خ.ل) ئێمە لە گۆشتی قوربــانیمــان نەدەخــوارد زیــاتر لەوسێ ڕۆژەی کەلە (مینا) دادەنیشتین کە چەند ڕۆژێکی ژمــراوە. پاشــان پێغــەمبەر (د) ماوەیدا بەم تەرزە فەرمووی بخۆن لەو وشتری قوربانیو هەدیو بە زەخیرەش هەڵ بگرن ئێمەش دەمانخواردو دەمان کردە قاوورمەش و بەزەخیرەش هەڵمان دەگرت.
(ش) هەڵ گرتنی گۆشتی قوربانی بەرای هەموو لایەك دروستە. بەلام لای ئیمامی شافعی دەبێ هەر چۆنێکی بی نەختێکی بدرێتە هەژاران. بەلام ئەگەر قوربانیەکە جەزای ئێچیربی یاخۆ نەذر بی حەرامە بۆ خاوەنەکەی بیخوا.

٤٧١ عن ابن عمـر (ض) اللَّهمَّ ارحم المحلِّقين. اللهمَّ ارحم المحلِّقين. والمقصِّرينَ. وفي روايةٍ اللهمَّ اغفر للْمحُلِّقينَ ثلاثاً وللمقصِّرين.

## تەرجەمە

٤٧١ دەگــێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر (خ.ل) گوتی پێغەمبەر لە حجة الوداع لە (منى) بۆ ئەوەی دەربچێ لە ئیحرام سەری پیرۆزیان تراشی. فەرمووی یاخودا رەحم بەوکەسانە بکەی کەسەری خۆیان بۆ دەرچوون لە ئیحرام دەتاشن هەنــدێ لە یارانی پێغــەمبەریش گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا. بلێ خودایە رەحم بەوکەسانەش بکەی کە هەندێ لە مووی سەریان کورت دەکەن (مقصّر) فەرمووی ئەی خودایە رەحم بەو کەسانەش بکەی کە (مقصّرن).
لەوەی کەلە ئەبوو هورەیرە دەگێڕنەوە وەکوو ئەمەیە.

# باب العُمرَةِ
# (باسی عومره)

٤٧٢ عن أبي هريرة (ض) العُمرَةُ الى العُمرَةِ كَفارَةٌ لما بينهما والحج المبرور ليسَ له جزاءُ الاّ الجنةُ.

## تەرجەمە

٤٧٢ ووشەی عومره بەزمانی عەرەب هاتووه لەگەڵ (ضەم و إسكانی میم) به (فەتحی عەینو اسكانی میمیش) هاتووه. له زمان بەواتەی زیارەته (گوتراویشه بەواتەی جێگایەكی ئاوەدان. بەلام بەشەرع مەبەستی چوونی كەعبەیه. بۆ خواپەرستی بەمەرجی دیاركراو لای ئیمامی شافعیو حەنبەلیەكان واجبه وەكوو حەج. لەبەر إقترانی بەحەج وەكوو لە ئایەت دەڵێ (واتموا الحج والعُمْرَةِ) لای ئیمامی مالك تطوعه ئەمە قسەی حەنەفیەكانه. لەبەر حەدیثی (بُنيَ الاسلام على خمس). باسی حەجی كردووه باسی عومرەی نەكردووه.
دەگێڕنەوه لەئەبو هورەیره (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی عومره لەحالی دووباره كردنەوەی بۆ گوناهێك كه لەبەینی هەردوو عومره رووەدا كەفارەیه. حەجی مەبروریش (یەعنی حەجی بێ ریاو بێگوناه. به غەیری بەهەشتی بەرز هیچ پاداشتی نییه (ش) پێغەمبەر(د) هەتا لەمەكه بوو هەموو ساڵی حەجی دەكرد. بەلام لەپاش كۆچی پێغەمبەر بۆمەدینه. بێجگه له (حجة الوداع)ی ناسراو هیچ حەجی تری نەكرد. بەلام چوارجار بەنییەتی حەج چووەناو ئیحرام لەگەڵ عومرەی حجة الوداع.
١ـ عومرەی ساڵی حودەیبیه ٢ـ عومرەی ساڵی پاش حودەیبیه بەگوێرەی پەیمانی حودەیبیه. ٣ـ عومرەی (الجعرانه). وەكوو لەغەزای حونەین گەراوه لەبەینی طائفو مەكه لەجوعرانه لەپاش دابەش كردنی غەنائمی حونەین. بۆ خاتری عومره دووباره چۆوه بۆمەكه. ٤ـ لەگەڵ حجه الوداع عومرەیشی كرد.

٤٧٦ عن عائشة (ض) ولكنها على قدْرِ نفقتك أو نَصَبِكِ.

## تەرجەمە

٤٧٣ دەگێڕنەوه لەدایكی ئیمانداران حەزرەتی عائشه (خ.ل) گوتی لەپاش حەج لەگەڵ برام وەكوو بۆ عومره چوومه تەنعیم پێغەمبەر (د) بێی گوتم ئەی عائشه پاداشتی ئەم عومرەیەت بەگوێرەی زۆر خەرج كردنی ماڵته یاخۆ فەرمووی بەگوێرەی

زۆر ماندوو بوون و ئەزیەت و ناخۆشیتە.

٤٧٤ عَن أبي هريرةَ (ض) السَفرُ قطعَةٌ مِن العذاب يمنَعُ احَدَكُمْ طعامَهُ و شرابه ونومَهُ فاذا قضى نهمَتَهُ فليَعَجِّلْ الى أهلِه.

## تەرجەمە

٤٧٤ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی سەفەر بەشێکە لە عذاب بە هۆی سوار بوون و دابەزین و جودا بوونەوە لەشوێنەی لێەتی. ماندوبون قەدەغە دەکا یەکێکتان لە خواردنەوەو لەخەوی خۆی. ئینجا ئەوەی سەفەر دەکا وەکوو ئیشو کاری خۆی بەجێ‌گەیاند باپەلە بکا بۆمالی خۆی‌و بۆلای ئیشتمان و کەسو کاری خۆی.

٤٧٥ عن كعب ابن عُجْرَةَ. يؤذيكَ هَوامّكَ. قالَ فاحلِقْ رأسَكَ او قالَ احلق صُمْ ثلاثَةَ أيامٍ أو تَصَدَّقْ بِفَرَقٍ بينَ سِتةٍ او انْسُكْ بماتَيَسَّرَ

## تەرجەمە

٤٧٥ دەگێڕنەوە لەکەعبی کوڕی عوجرەی کوڕی ئومیەی بەلوی. کەئەویش لای ئەنصاربوو. ئامادەی حودەیبەبوو. دەرحەق بەوی قسەی فدیە هاتەخواری دەستێکی لەغەزا لێ کرابۆوە. پاشان لەشاری کووفە جێ‌نیشبوو لەمێژووی پەنجاو یەك لەشاری مەدینە مرد.

دوو حەدیثی هەیە لەبوخاری شەریف ئینجا گوتی لەشەری حودەیبە هەموومان بەنیەتی عومرە چووبووینە ئیحرام.

پێغەمبەر(د) لەسەرمن راوەستا سەریشم وورده وورده ئەسپێ‌ی لێ هەڵدەوەرا فەرمووی ئەرێ ئەمە حەشەراتی ئازاردەری جەستەت ئازارت دەدەن (یەعنی ئەسپی) گوتم. بەلێ: فەرمووی سەرت بتراشە ئەم ئایتەش (فمن كان منكم مريضاً أو به اذىً من راسه ففديةٌ من صيام او صدقةٌ او نسُكٍ) دەرهەق بەمن هاتە خواری ئینجا پێغەمبەر (د) فەرمووی سێ رۆژ بە رۆژوبە یا خۆ یەك (فرەق) بکە صەدەقە لە نێوان شەش کەس کە پێویست بێ

(ش) (فەرەق) پێوەرێکی ناسراوە لەمەدینە هەریەك (فەرەق) سێ ربەیەوە هەر ربەیەك چوارمستە یەعنی هەر موحتاجێك نیوصاع لەخورمای‌بێ‌بدە یاخۆ ئەوەندەی

پێت دەکرێ قوربانیەك بکوژەوە لە جیاتی سەرتراشینەکەت کەعب گوتی ئەم ئایەتی فیدیە. ئەگەر چی دەرحەق بەمن هاتە خوارێ. هاتنە خوارەوەی بۆکەسێکە بەلام حوکمی بۆ هەموو کەسە تا قیامەت.

## باب جزاء الصيد إذا باشر المحرمُ قتلَهُ.
## باسی جەزای نێچیر وەکوو (موحریم) بی‌یەوێ بیکوژێ.

٤٧٦ عَن أبي قتادَةَ كلوا. يعني حمارَوحشٍ وَهم محرِمون.

### تەرجەمە

٤٧٦ دەگێڕنـەوە لەئەبی‌قەتادە (خ ل) گوتی ئێمە لەخدمەت پێغەمبەر (د) دەرچـووین لەشـاری مەدینـە بەرەوشـاری (مـەکـە) لەسـالی حودەیبـیە یارانی پێغـەمبـەریش هەمـوو بەنی‌یەتی عومرە داخل ئیحرام ببوون من داخل نەبووم. خەبـەرمـان پێدرا دوژمنـەکانی کە ئەیان دەهێشت بچینە(مەکە) هێزیان هاتوتە (غـەیقـە) جێگایەکە لەنێوان مەکەو مەدینە پێغەمبەریش(د) بۆ زانینی کاروباری دوژمەن و چەند کەسی تری نارد لەرێگا تووشی کەرێکی کێوی هاتین منیش بە رمەکەوە غارمدا سەری کوشتم هەوالەکانم چونکی لەئیحرام بوون یارمەتیان نەدام هەر چۆنی بوو کەولم کرد وکـولانـدمـو بەخـۆمو هەوالەکانم. گۆشتەکەمان خوارد. ئەختێ لە گۆشتـەکە مابوو ها تین کە پشتینە پێغەمبەر (د) حیکایەتی کوشتنی کەرەکێوی‌و گۆشت خواردنمان بۆ کرد. گوتمان هەندێ گۆشتیش ماوەتەوە. بەهەموومانی گوت بیخۆن یەعنی حەلالە بۆ ئەو کەسەی لەئیحرامدایە بخوا نێچیری ئەوکەسەی لە ئیحرامدانی‌یە.

(ش) لەئیحرام نەبوونی ئەبوو قەتادە وا دەزاندرێ کە دروستە چوونە ناو حەرەم بەبێ ئیحرام. بەحەج و عومرە لای شافعی بەلام لای هەرسێ ئیمام ئیحرام واجبە. وە گوتویانە واجبە بەرامبەر شافعی ئەم وەلامەیان داوەتەوە گوایە شافعی دەلێ ئەگەر دروست نەبوایە چوونە ناوحەرەم بەبێ ئیحرام بۆچی ئەبوو قەتادە لەحەرەم داخل ئیحرام نەبوو. سێ ئیمامەکەی تریش جوابی شافعیان داوەتەوە بۆیێ ئەبوو قەتادە داخل ئەبوو چونکە پێغەمبەر بۆ لایێکی تری ناردبوو بۆ بە دیار خستنی دوژمن.

٤٧٧ عن الصعب ابن جثامَةَ (ض) إنّا لم نردّهُ إلاّ أنّا حُرُمٌ.

## تەرجەمە

٤٧٧ دەگێڕنەوە لەکوڕی عەباس (خ.ل) صەعبی کوڕی جوثامەی لەیثی (خ.ل) کەرێکی کیوی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر (د) پێغەمبەر ناردیەوە لە بۆی وەکو دیتی صەعب بەم ناردنەوەیە زۆر پێی ناخۆش بوو بۆ دڵدانەوەی صەعب فەرموی نیمە لەبەر شتێك نەمان ناردەوە تۆ دلت عاجز نەبی. تەنیا بۆیێ ناردمانەوە چونکی لە ئیحرام دابووین.

(ش) لەبەر ئەم دوو حەدیثە حەدیثی ئەبوو قەتادە وەحەدیثی صەعب اختلاف لە خواردنی نێچیر بۆ محریم پەیدابووە لای جەماعەتێك لەسەلەف وەکوو حەزرەتی علی و کوڕی عەباس وکوڕی عومەر بەتەواوی قەدەغەیە چی بۆ نێچیر کرا بێ یاخۆ بە ئەمری ئەو بێ یابە ئەمری ئەو نەبێ لای مالکو شافعیش ئەو کاتە مەمنووعە (قەدەغەیە). ئەگەر ئەوی لە ئیحرامە بۆ خۆی نێچیری کردبێ یاخۆ بۆی گیرابێ چی بەئیزنی ئەوبێ یاخۆ بەئیزنی ئەو نەبێ.

لای حەنبەلیەکانیش احتمالێك هەیە بۆ دروست بوونی خواردنی نێچیرێك کە بۆ ئەو نێچیر کرابێ. لای هەندێ حەنەفیەکانیش دروستە خواردنی نێچیرێك کە ئەوی لە ئیحرام نەبێ نێچیری گرتبێ بە مەرجێك ئەوی لە ئیحرامە نیشانی نەدا بێو فەرمانیشی پێ نەکردبێ کەنێچیری بکا (ئەمە لە شەرقاوی باس دەکا).

٤٧٨ عن عائشةَ (ض) خمسٌ مِنَ الدّوابِّ فاسِقٌ يُقتَلْنَ في الحرمِ الغرابُ والحدَأةُ والعقرَبُ والفأرَةُ والكَلْبُ العَقورُ.

## تەرجەمە

٤٧٨ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی پێنج لە حەیوانات فاسقن یەعنی لەبەر ئەزیەت گەیاندن بە خەڵکی دەرچووینە لە گوێ رایەڵی خەڵك لە حەرەم دەکوژرێن ١ـ قەل ٢ـ باشووکە ٣ـ دووپشك ٤ـ مشك ٥ـ سەگێکی خەڵك بریندار بکا سەگێکی ئەگەر خەڵك بریندار نەکا لای شافعی حەرامە بکوژرێ لای هەندێکان مەکروهە ئەگەر بۆ ڕاوو پاس کردن نەبێ.

٤٧٩ عن عبدالله أقتلوها وُقِيَت شرُّكُمْ كما وُقيتُم شرَّها.

## تەرجەمە

٤٧٩ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی مەسعود (خ.ل) گوتی ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر بووین لە غارێك لە (منا) لە ناكاو سورەی (والمرسلات) هاتە خوارێ بۆ سەر پێغەمبەر (د) دەی خوێندەوە منیش لە دەمی پیرۆزی ئەوم وەردەگرت. هێشتا دەمی پیرۆزی لە خوێندنەوە هەر تەڕبوو، لەناكاو مارێكمان لێ راست هات. پێغەمبەر (د) فەرمووی بیكوژن ئێمەش بۆ كوشتنی تاڵووكەمان كرد مارەكە ڕۆیی. فەرمووی پارێزرا لە شەڕی ئێوە چلۆنیك ئێوە پارێزران لە شەڕی ئەو وا زاندرا لەم حەدیثە پیرۆزە بۆ ئەو كەسەی لە ئیحرامە دروستە كوشتنی حەیوانانی بەزیان و زەرەر.

٤٨٠ عن عائِشَةَ. فُوَيسِقٌ. قالَهُ لِلوَزَغِ.

## تەرجەمە

٤٨٠ دەگێڕنەوە لە عائشە (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی قومقمۆك چونكی لە گیاندارێ ئەزیەت دەرە دەرچووە لەگوێ رایەلی خەڵك عائشە گوتی گوێم لێنەبوو ئەمر بەكوشتنی بكا.
(ش) بەلام ناوبردنی بە (فُوَيْسِقٌ) وا پیشان دەدا كە كوشتنی باشە. كە عائشەش گوێی لەنەبی مەرج نی یە خەڵكی تر گوێی لێنەبێ. چونكی لە بوخاری و مسلم ثابتە دیارە. ئەمری فەرمووە بەكوشتنی قومقمۆك.

٤٨١ عَن ابن عباس (ض) لاهِجرَةَ. ولكن جهادٌ. ونيّة وَاِذا استُنفِرتُم فانفِروا.

## تەرجەمە

٤٨١ دەگێڕنەوە لە كوڕی عەباس (خ.ل) گوتی ئەو ڕۆژەی كە (مەكە) فەتح كرا. پێغەمبەر (د) فەرمووی كۆچ كردن بۆ مەدینە بەواجبی نەما بەلام بۆ ئێوە غەزای كافران و نی یەتێكی باشی ئەوە بكەینێ كە لە كافران جودا دەبی یەوە هەیە ئنجا وەكوو لەلایەن ئیمامی ئیسلام فەرمانتان پێكرا بچنە دەرێ بۆ غەزای كافران بچونە دەرێ. یاخۆ ئەگەر لە دار الكفر دا بوون واجبە كۆچ بكەن بۆ دار الاسلام وە حوكمی واجب بوونی ئەم كۆچ كردنە تا قیامەت هەر ماوە. بەلام دەربارەی ناسینی دار الاسلام و دار الكفر ئیمامەكانی مجتهد رایان لە یەكتر جیاوازە لای ئیمامی شافعی

هەر وڵاتێك یەك جار کەوتبێتە دەست ئیسلام بادووبارە کافریش بیگرتەوە نابیتە دار الکفر. بۆ اسلامی ئەو وڵاتە تاقیامەت هەر دار الاسلامە.
فەرموویەتی [لما صارَ دار اسلامك أوّلاً لایصیراً دار کفر بعده أبداً.
سەرەنجام ئەو وڵاتانەی کە ئیسلامن ئێستا گیراوون وەکوو مصرو فلسطین و سوریەو عیراق و هیندستان هەمووی ماڵی ئیسلامە لای ئیمامی ئەعزەمیش فەرموویتی لەو وڵاتەی کە کافر گرتوویەتی لە هەر گوندێك یا شارۆچکەیەك بانگی محمدی لێ بدرێ بامسلمانەکان سێ کەسیش بن. ئەو گوندە یا ئەو شارۆچکەیە دار الاسلامە دار الکفر نییە. بەتایبەتی بەملیۆن خەڵك مسلمان هەن بەبانگ دان و نوێژکردن لە وڵاتانی ژێردەستی ئیستعمار (ئیمپریالیزم). هیجرەتیان تێدا واجب نییە. وە ئەو بەشە زانایانەی ئایینی کە فتوایان داوە بۆ خەڵکی هەژار بە واجب بوونی هیجرەت و کۆچ کردن. چونکی ئێمە لە دار الکفرین ئەوانەلە ڕێگای ڕاست دوورن.

٤٨٢ عَن أنس (ض) قال رسول الله صلی الله تعالیٰ علیه وسلم اقتلوه.

## تەرجەمە

٢٨٢ دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالك (خ ل). پێغەمبەر (د) ساڵی گرتنی مەکە هاتە ناوەکە. کڵاوزرێ لەسەری بوو (واتە بەچلکی شەڕی هاتە ناوەکە) ئەبو برزە ئەضلەی کوڕی عوبەیدی ئەسلەمی هات گوتی ئەی پێغەمبەری خوا (خەطل) کە لە جاهیلەت ناوی عبدالعزی بوو لە پاش مسلمان بوون ناویان لێنا عبدالله بۆیێ پێیان دەگوت خەطل چونکی لاکلاوزێڕیکی گورت تر بوو لەلایەکەی تر. لە مندالانی تەیمی کوڕی غالبی کوڕی فەهـرـبوو). خۆی بە ئەستاری کەعبە هەڵواسیوە بۆ ئەوەی نەکوژرێ پێغەمبەر (د) فەرمووی بیکوژن. ئنجا ئەبوو برزە و سعیدی کوڕی حوریث کوشتیان.
هۆی فەرمانـدانیـی بەکـوشتنی ئەو کابـرایە ئەوەبوو. پێغەمبەر کردبووی بە ئیشکەر لەسەر صەدەقات واتە زەکات کۆیکاتەوە. لە ئەنصاریش پیاوێکی لەگەڵ نارد نوکەرێکی خۆشی لەگەڵ بوو مسلمان بوو لە قوناغێك دابەزین. فەرمانی بە نوکەرەکەی کرد. گیسکە نێرێکی بۆ بکوژێتەوە و بیکاتە خواردن و چێشت وەکوو لەخەو هەڵستا ئەی کوشتبوو چووە سەری کوشتی. پاشانیش ئایینی ئیسلامی بەجێهێشت گەڕاوە سەر بوت پەرستی. دوو جاریەشی هەبوو بەجنێوەان بە پێغەمبەر گۆرانییان دەگوت.
هۆی کوشتنی لەبەر کوشتنی نوکەرەکەی مسلمانی بوو ئەوەیك دووەم لەبەر

گەرانەوەی بوو بۆ کافری لە بەر جنێودان بە پێغەمبەر نەبوو.
(ش) امامی مالك ئەم حەدیثەی کردووتە بەلگە لەسەر دروست بوونی کوشتنەوەی (قاتل) واتە کوژەر لە حەرەمی (مەکە) ئەبوو حەنیفە فەرموویتی دروست نی یە واتەی ئەم حەدیثەی والێك داوەتەوە ووتوویە مەبەستی هەر ئەو سەعاتە بووە کەئەو سەعاتە حەلال بووە کە ئیقامەی حدود بکرێ لە مەککە.

٤٨٣ عن ابن عباس (ض) نَعم حَجّي عنها أرأيتِ لوكان على أمُّكِ دَيْنٌ أكنتِ قاضِيةً عنها أقضوا الله. فالله أحقُّ بالوَفاءِ.

## تەرجەمە

٣٨٣ دەگێڕنـەوە لە کوڕی عەبـاس (خ.ل) ژنی سەنانی کوڕی عبداللەی جەهەنی هاتە خزمەت پێغەمبەر (د) گوتی دایکم لەسەر خۆی نەزر کرد کە حەج بکا. حەجیشی نەکرد وەفاتی کرد ئنجا ئایا دروستە من حەجی لەجیاتی بکەم فەرمووی حەجی لە جیاتی بکە ئەگەر دایکت قەرزی کەسێکی لابێ تۆ قەرزەکەی بۆ دەدەیەوە یاخۆ نایدەی گوتی ئەیدەم. فەرمووی کەوایە قەرزی خودایشی لە جیاتی بدە خودا لایق ترە کە حەقی بدرێتـەوە لەبەندە. (ش) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەمە یەکێك مرد حەقی خودای لەسەر هەبوو وەکوو حەج و کەفارەو نەذر. واجبە دانەوەیان لە جیاتی مردووەکە. وە دەبی پێش قەرزی خەلکی بدرێتەوە.

٤٨٤ عن ابنِ عباس. (ض) مامنَعَكِ مِن الحج فأنَّ عُمرَةً في رمَضانَ تقضي حجةً معي.

## تەرجەمە

٤٨٤ دەگێڕنەوە لە عبد اللەی کوڕی عەباس (خ.ل) گوتی وەکوو پێغەمبەر (د) گەراوە لە حەج بە ئومی سەنانی ئەنصاریەی گوت. بۆچی بۆ حەج نەهاتی. گوتی باوکی سەنان یەعنی مێردەکەم دوو ووشتری ئاوکێشانی هەبوو یەکێکی برد بۆ حەج لە خدمەت بیغەمبەر (د) ئەویتریش عەردمان پێ ئاو دەدا. پێغەمبەر (د) لە ڕەووشتی باشی خۆی فەرمـووی عومرە یەك کە لە مانگی ڕەمەزان بکرێ لەگەڵ من بەرامبەر حەجێکـە لە چاکـەو پاداشت. (ش) مەعنای ئەوە نی یە کە عومرەیەك لە ڕەمەزان حەجێك دەگێڕێتەوە.
بەم تەرزە حەجی لە سەر لابچی. چونکی حەج لە سەری لا ناچی ئەگـەر هەزار

عومرەش بکا دەبێ حەج بکا لە کاتی خۆی. ئەوەی لە حەدیث دیارە وا دەگەیەنێ بە بەر حەج دەکەوی ئەمەیان لە بابی مبالغەو الحاقی ناقصە بە کامل واتە زێدە رۆیی کی پێوە دیارە و گەیاندنی کەمە بەشتێکی زۆر لەبەر تەرغیب و هاندانی خەلکە.

٤٨٥ عن أبي سعيد (ض) أن لاتسافرَ إمرأةُ مسيرةَ يومَيْن ليس معها زوجها أو ذو مَحْرم ولا صومَ يومَيْن الفِطر والاضحى. ولا صلاةَ بعد صلاتين. بعْد العصرِ حتى تغرُبَ الشمسُ وبعْدَ الصبحِ حتى تطلُعَ الشمسُ. ولا تُشد الرِّحالُ إلاّ الى ثلثةِ مساجِدَ. مسجدِ الحرام. ومسجدي ومسجدِ الأقصى.

## تەرجەمە

٤٨٥ دەگێرنەوە لە ئەبوو سعید (خ.ل) کە لە دوازدە غەزایان لە خدمەت پێغەمبەر بوو (د) کوتی چوار (ووشە)ی پڕ حیکمەتم لە پێغەمبەر گوێ لێ بوو بە تەواوی کرانەوەی سینگم بە حیکمەتیان سەرم لێیان سوڕما. یەکێکیان ئەمەیە
١- بەسەفەر نەچی ئافرەت ڕێگای دوو ڕۆژ. بەبێ مێردی یاخۆ بەبێ کەسێك کە دەست نوێژی لێ ی نەشکێ.
٢- ڕۆژوو نی یە لە دوو ڕۆژ لە سالدا ڕۆژی جێژنەی ڕەمەزان و قوربان
٣- هیچ نوێژیش نی یە لە پاش دوو نوێژ لە پاش نوێژی عەسرهەتا ڕۆژئاوا.
لە پاش نوێژی سبەینەیش هەتا ڕۆژهەلاتن. ٤- چوارەم بۆ زیارەتی یا بۆ نوێژ لێ کردنی هیچ مزگەوتێك دروست نی یە سەفەر کردن مەگەر بۆ سێ مزگەوت نەبێ.
١- یەکی یان بۆ کەعبە ٢- ئەم مزگەوتەی من یەعنی مزگەوتی مەدینە ٣- مزگەوتی قودس. (ش) دیار کردنی دوو ڕۆژ لە دروست نەبوونی سەفەری ئافرەت بەبێ کەسوکاری مەبەست نی یە. چونکی لە حەدیثی عائشە هاتووە. ببرای ببرای سەفەر بۆ ئافرەت بێ مەحرەم دروست نی یە ئەگەر بۆ دەرەوەی شوورەش بێ.

٤٨٦ عَن أنس (ض) ما بالُ هذا قالوا نَذَرَ ان يمشي الى الكعبةِ قال إنَ الله عن تعذيبِ هذا نفسه لَغنيٌ وأمَرَهُ أن يركَبَ.

## تەرجەمە

٤٨٦ دەگێرنەوە لە ئەنەس (خ.ل) پێغەمبەر (د) پیرە مێردێکی دیت لە بەینی دوو کوری خۆی قۆلیان گرتبوو دەرۆیشت بەهێزیان پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەم

ئیختیاره بێ تاقەتە بۆچی سواری شتێکی ناکەن پێیان گوت. ئەمە نەزری کردووە که بەقاچەکانی خۆی بڕوا بۆ کەعبە فەرمووی خودای گەورە له عەزابدانی ئەمە بێ نیازە. وه فەرمانیشی پێ فەرموو کە سواربێ
(ش) بۆچی ئەمری پێ نەفەرموو کە نەزرەکەی بەجێ بگەیەنێ. (وەلام) له بەر دووشتە (یەکێیان) یاخۆ حەج بە سواری خێری زیاترە لە پیادە. لەوەفای نەزرەکەشی نەکردنی چاکترینیان بەجێ بێ. کە دەبێتە هۆی پێویستی وەفا بەنەزر. (دووەمیان) یاخۆ وەفای نەزرەکەی لە تاقەتی خۆی بە دەربوو. دووەم ڕا دیارترە ـ لە پەرتووکی (فتح) وا دەڵێ.
لە هۆی یەکەمێن وا دەزاندرێ حەج کردن بە تەیارە لە بەرزترینی هەموو پلەکانە وەکوو ئەم کاتە (١٣٧٢هـ)[١]

٤٨٧ عن عقبة ابن عامر (ض) لتَمْشِ ولترْكَبْ.

## تەرجەمە

٤٨٧ ـ دەگێڕنەوە لە عەقەبەی کوڕی عامر (خ ل) خوشکم لە سەر خۆی نەزرکردبوو کە بەپێیان بۆ ماڵی خودا بچێ. فەرمانی پێ کردم بە پێغەمبەر بڵێم. منیش پێم گوت فەرمووی. بابە پێیانیش بڕوا باسواریش بێ.
(ش) لێرەدا ڕای جۆر بە جۆر هەیە ئەگەر کەسێك نەزریکرد کە بە پیادە حەج بکا. ئیمامی رافعی گوتیتێ دیارترین ئەوەیە بەجێ گەیاندنی نەزرەکەیتی (واتە بە پیادە بڕوا). ئیمامی ئەوەیش گوتیتی بە سواری بڕوا بەسواری چاکترە

---

(١) له سەر ئەم ڕایە بوو بۆیە مەلا حسین خۆی کە چوو بۆ حەج لە ساڵی ١٩٦٠ بە تەیارە چوو و هاتەوە. (بلاوکەرەوە) .

بسم الله الرحمن الرحيم

# باسی گەورایەتی حەرەمی مەدینە
# (بحث فضائل حرم المدينة)

٤٨٨ عَن أنس (ض) المدينةُ حَرَم مِن كذا الىٰ كذا لا يُقطَعُ شجَرُها ولا يُحدَثُ فيها حَدثٌ مَن أحْدَثَ فيها حَدَثاً فعليهِ لعنة اللّهِ والملائكةِ والناسِ أجمعين.

## تەرجەمە

٤٨٨ دەگێڕنەوە لەئەنەس (خ.ل) پێغەمبەر (د) فەرمووی مەدینە مابەینی ئەم دوو جێگایە (عیرو ثەور). ثەور لە مەدینە چیایەکی بچووکی خڕە لە پشتەوەی ئوحودە لەلای سەرووی نەك ثەوری مەکە. خاوەنی قاموس وای ڕاست کردووتەوە). نابڕێ دارو درەختی نیشێکی واشی لێ ناکرێ بە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ وەکوو کوشتن و ماڵ بردنی بەستەم. هەرکەسێك کارێکی وا بکا لە مەدینە. بە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ وەکوو کوشتن و ماڵ بردنی بە زوڵم لەعنەتی خوداو مەلائکەو هەموو ئینسانی لە سەربێ

(ش) مەبەست لە (لعن) عەزابێکە کە بەگوناهەکە موستەحەق دەبێ. مەبەست دوور خستن لە ڕەحمەت نی‌یە.

وەکوو لەعنەتی کافران لای شافعی ئەمە بەڵگەیە لەسەر قەدەغە بوونی ڕاوی نێچیر لە مەدینە وەبڕینی درەختەکانی وەکوو حەرەمی مەکە بەڵام ضەمانی تیا نی‌یە چونکی وەکـو مەکە جێ‌ی (نُسُك) نیە واتە داب و نەریتی حەج نی‌یە لای ئەبوو حەنیفەو محمد و یوسف مەدینە هیچ حەرەمی نی‌یە وەکوو مەکە. کەوایە قەدەغە نی‌یە داریشی لێ ببڕێ وە ڕاوی نێچریشی لێ بکرێ.

وەلامی ئەم حەدیثەشیـان واداوەتـەوە مەبـەستی پێغەمبەر (د) لەم فەرموودەیە مانەوەی جوانی مەدینەیە. هەتا دانیشتووەکانی پێیان خۆش بێ لەم شوێنە ڕابێن و نەبزوون

٤٨٩ عن أبي هريرة (ض) حُرِّمَ ما بينَ لابتَي المدينةِ على لساني أراكم يابني حارثةَ قدخرَجتم. مِنَ الحَرمِ بَلْ أنتم فيهِ.

٤٨٩ دهگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (خ.ل) ئەویش لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە (د) فەرمووی عارەکانی نێوان چەقینی ڕۆژهەلات و چەقینی ڕۆژئاوا گێڕدراوە بە (حەرەم). لە شاری مەدینە. لەسەر زمانی من. پێغەمبەر (د) هاتە ناو قەبیلەی بەنی حارثە کە ئەوانیش کۆمەلێکن لە ئەوس. ئەو کاتە مالیان لەلای ڕۆژئاوای مەشهەدی ئیمام حەمزە بوو. فەرمووی ئەی بەنی حارثە ئێوە لە حەرەمی مەدینە دەرچووینە. پاشان ئاوڕێکی دایەوە فەرمووی نا. بەلکی ئێوە لە ناو حەرەمن چونکی پێشان وای دەزانی کە لە دەرەوەی (حەرەمن). پاشان وەکوو ئاوڕی دایەوە بۆی ساغ بۆ وەکە لەناو حەرەمن.

(ش) موهەلەب لەم حەدیثەی وەرگرتووە دروستە بۆ پیاوی زانا. ئەگەر لای وابوو ڕاستە. پاشان بەلێکدانەوەو ووردبوونەوە بۆی ساغ بۆوە کە ڕاست نی‌یە. دروستە قسەکەی خۆی ڕاست بکاتەوە وە لەو قسەی پێشووی پەشێمان بێتەوە.

ئەوەی دیارە لەم حەدیثە ئەوەیە ئاوڕدانەوەی پێغەمبەر (د) بۆ ئەم حوکمە بووە.

٤٩٠ عن عليّ (ض) المدينةُ حَرَمٌ ما بينَ عائرٍ الى كذا مَن أحْدَثَ فيها. حدثاً أو آوى محدثاً فعلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ والملائكةِ والنَّاسِ أجمعينَ. لا يقبلُ منهُ صَرْفٌ ولا عَدلٌ ذمّةُ المسلمين واحِدَةٌ فمن أخفرَ مسلماً فعَلَيْهِ لعنَةُ اللّهِ والملائكةِ والنَّاسِ أجمعين لا يقبلُ منه صرْفٌ ولا عدلٌ وَمَن توَلىٰ قوْماً بغيرِ إذنِ مواليهِ فعليهِ لعنَةُ الله والملائكة والناس أجمعين لا يُقبلَ منه صرف ولا عدلٌ

## تەرجەمە

٤٩٠ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عەلی (خ.ل) گوتی لای ئێمە هیچ شتێکی نووسراو نی‌یە قورئان نەبێ. ئەم لاپەڕەیەش نەبێ کە لە ناو کالانی شیری من دایە یەقەیان بەرنەدا هەتا کاغەزەکەیان بۆ هێنا دەری وەکوو دیتی یان لە ناوی نووسرابوو. پێغەمبەر (د) فەرمووی مەدینە (حەرەمی) پیرۆزە ملبەینی کێوی عائرو فلان جێگا هەر کەسێک لەم سنووری باس کراو شتێکی خراپی تازە پەیدا بکا یا ئەو کەسە بحەوێنێتەوە کە ئەوکارە خراپەی داهێناوە لە سەر ئەوی بی لە عنەتی خوداو مەلائکەو هەموو خەلکی قبول ناکرێ لەو کەسە ئەسوننەت و نەفەرز یاخۆ نەتۆبەو نەفدیە و بەدەل فدیە. ئەمان دانی موسولمانان شتێکی یەکسانە لە بەینی هەموویان. هەژارو دەولەمەندو پیاوی دیارو بەرێزو نادیار بۆ ئەمان دانی کافرێک فەرقیان نی‌یە چی

رووبـدا لە یەکێـك یا لەزۆر کەس. ئنجـا هەرکـەسێـك پەیمانی موسولمانێك هەل بوەشێنێتـەوە. لەسەر ئەوە لەعنەتی خوداو مەلائکەو هەموو خەڵکی. قبول ناکرێ لەوکەسە نەسونەت و نەفەرزوە هەر کەسیکیش قەومێك بکاتە دۆست و کەسی خۆی بەبێ ئیزنی سوێند خۆرو خزم و کەسی خۆی لە سەر ئەوە لەعنەتی خواو مەلائکەو هەموو خەڵکی لەوکەسە قبوول ناکرێ نەسونەت و نەفەرز

٤٩١ عن أبي هريرَةَ (ض) اُمِرْتُ بقريَةٍ تأكُلُ القرى يقولون يَثربُ وَهيَ المدينةُ تنفي الناسَ كما ينفي الكيرُ خبثَ الحديدِ

## تەرجەمە

٤٩١ دەگێڕنـەوە لە ئەبـوو هوریرە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی. فەرمانی بەمن کرد خودا یی من بەکۆچ کردن بۆ گوندێك دەخوا هەموو گوندان (یەعنی زال دەبی بەسەر وولاتانی دیکە). هەندێ لە منافقان پێی دەڵێن (یەثریب) ناوی دەبەن بەناوی یەکێك لە عەمالقە کاتی خۆی لەوێ ژیاوە. ئنجا پێغەمبەر رکی لەم ناوەی بۆوە چونکی ئەم ناوە یا لە (تـەثـریب) هاتـووەکە بەمەعنا رەنجاندن و دڵ شکاندنە. یاخۆ لە (ثرب) کە بەمەعنا خراپەیە هەربۆیانیش ناشیرین پێغەمبەریش (د) حەزی لەناوی شیرین و جوان دەکرد. بۆیێ ئەم ناوەی گۆرییەوە بە (طابە) وە بە (مەدینە). هەروەکوو پێی دەڵێن (المدینە) یەعنی شاری (کامل ـ تەواو) چونکی کەبـاسی شتێکی گشتی بکـرێ مەبەست شتێکی تایبەتی تەواوە. یاخۆ ووشەیەك کەلەدوو ووشە یا زیاتر پێك هاتبی مەبەست گەورە کردن و رێزگرتنە. وەکو شاعیری عەرەبی دەڵێ (هم القومُ كل القوم يا أُمّ خالد)

لە قورئان کەناو براوە بەیەثریب حیکایەت لە منافقان دەکا کە گوتیان یا أهْلَ يثربَ لامقام لكم ئینجا ئەم مدینەیە پیاوی خراپ لادەبا وناهیلی لە زەمانی پێغەمبەر خۆیەوە لە زەمانی دەجالیش . هەروەکوو هەمبانە دەڵێ ئاسنگەر چلك وپیسی ئاسن لا دەبا

٤٩٢ عَن أبي حُميْدٍ (ض) هذه طابَةٌ

## تەرجەمە

٤٩٢ دەگێڕنەوە لە ئەبو حومەید (خ.ل) گوتی هاتینەوە لای پێغەمبەر (د) لە

تەبووك وەكوو لە مەدینە بەدیارکەوتین. فەرمووی ئەمە طابەیە. (بۆ مەدینەی پیرۆز لەسەر فەرموودەی شەرقاوی چل ناو هەیە بەڵام ئەمەندەی کە زاندراوە ١ـ مەدینە ٢ـ طابە ٣ـ طیبە ٤ـ طائب ٥ـ بیت الرسول ٦ـ حرم الرسول ناوی کۆنیشی ٧ـ (یەثربە)

٤٩٣ عن أبي هريرة (رض) يتركون المدينةَ على خير ماكانت لايغشاها الاّ العواف يريدُ عَوافي السباع والطير وآخرُ مَن يُحشَرُ راعيانِ مِن مُزينَةَ يريدان المدينةَ ينعقان بغنمهما فيجدانها وَحوشاً حَتىٰ اذا بلغا ثنيَّةَ الوداع خرّا على وجوههما

## تەرجەمە

٤٩٣ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) گوتی بیستم لە پێغەمبەری خودا (د) دەی فەرموو مەدینە جێ دێلن لەسەرکە ماڵی باشی و خۆشی و میوەجاتی زۆرو فرەوانیو هەرزانی. لەودا دانانیشی ئەو کەسە نەبێ کە داوای خواردن دەکا لە حەیواناتی کێویو مەل دوای هەمو ئینسانیش دوو شوان لە قەبیلەی موزەینە دەمرن پێش ئەوەی بمرن روو لە مەدینەی دەکەن و مەڕی خۆیان بەدەنگدان و بەبانگ کردن لێ دەخوڕن دەبینن مەدینە چۆلە کەس تیانییە هەتا دەگەنە (ئەنیة الوداع) جێگایەکە کە دەکەوێتە لای شام بەرێ کردنی ئەوانەی سەفەر دەکەن هەتا ئەوێیە). هەردوو شوانەکان لەسەر روویان دەکەون دەمرن.

(ش) ئیمامی نەوەوی دەڵێ بەدەلیل ئەم دوو شوانانە کە لەدوایی هەموو ئادەمیزاد دەمرن لە ئاخری زەمان مەدینە وای بەسەر دێ.

یەعنی لە هیچ جێگایەك هیچ کەس نەماوە ئنجا ئەم دووکەسە دەمرن مرۆڤ تەواو دەبن.

٤٩٤ عن سفيان ابن زهير (رض) تُفتَحُ اليمنُ فيأتي قومٌ يَبسّونَ فيتحمّلونَ بأهليهم وَمن أطاعهم والمدينةُ خيرٌ لهم لو كانوا يعلمون وتفتحُ الشام فيأتي قومٌ يبسّونَ فيتحملون بأهليهم ومن اطاعهم والمدينة خير لهم لو كانوا يعلمون وتفتح العِراقُ فيأتي قومٌ يبسّونَ فيتحمّلونَ. بأهليهم وَمَن أطاعهم والمدينة خيرٌ لهم لوكانوا يعلمونَ.

## تەرجەمە

٤٩٤ دەگێڕنەوە لە سوفیانی کوڕی زوهەیر (خ.ل) گوتی گوێم لێبوو پێغەمبەر

(د) دەی فەرموو وولاتی یەمەن دەگیرێ. قەومێك دێن لە مەدینەوە بە حەیوانات و ماڵاتی خۆیـان وورده وورده لێ دەخورن وە بەوکەسانەشەوە کە لەژێر فەرماندەی ئەوانـدانە بۆ لای یەمەن. چونکی لایان وایە ئەوێ جێگای کەلك وەرگرتنەو بێت و چاکــەیــە. حالیش وایــە بۆ ئەوان مەدینــە باشتــرە لێ دانیشن گەر ئەوان بزانن چاکییەکانی مەدینە.

شامیش دەگیرێ. ئنجا قەومێك دێ بە حەیواناتی خۆیانەوە کەلەسەر خۆ لێ دەخورن. پاشان کەسوکاری خۆیان و ئەوانەی لەژێر فەرماندەی ئەوانن بۆشام. حالیش وایە مەدینە باشترە بۆ ئەوان ئەگەر بزانن چاکەکانی مەدینە چەندە.

عیراقیش دەگیرێ پاشان قەومێك دێ بەنەرمە لێخوڕینی حەیواناتی خۆیانەوە ئنجا هەڵدەگرن خزم و کەسی خۆیان و ئەوانەی کە لەژێر فەرماندەی ئەوانیش دانە، بۆ عیراق. کە حالیش وایە بۆ ئەوان دانیشتنی مەدینە باشترە ئەگەر ئەوان سوودەکانی مەدینە بزانن چەند زۆرە.

(ش) ئەم حەدیثە پیرۆزە لە معجزاتی پێغەمبەرە. چونکی لە زەمانی خۆی کە خۆی هەبووە شام و عیراق نەگیرابوو یەمەنیش بە تەواوی نەگیرابوو. پاشان لەسەر ئەو تەرتیبەی کەباسمان کرد یەك لەپاش یەك گیران.

زەمی ئەوانە دەکا کەلە مەدینە بارەکەن لەبەر بێزاری کردن لەم شارە.

نەك بۆ حاجەتێك بێ وەکو جیهادو بانگکاری مەشغلەن. ئەمانە لەمەعنای حەدیث بەدەرن.

٤٩٥ عن أبي هريرةَ (ض) انَّ الايمانَ ليأرزُ الى المدينةِ كما تأرزُ الحيّةُ الى جُحرِها.

## تەرجەمە

٤٩٥ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (خ ل) بەڕاستی پێغەمبەر فەرمووی (د) بەبێ گومـان خەڵکی مەدینــە لە کاتی بڵاوبـوونەوەیان لەهەموو لایەکی عارد بەهێزو ڕاکێشـانی خۆشـەویستی خوداو پێغەمبەر لە مەدینە. کۆدەبنەوە وە خۆیان لەوێ دەمخزێنن. وەکوو ڕاخزینی مارو کۆبوونەوەی لەناوکونی خۆی بۆ ژیان و گوزەرانی خۆی.

(ش) ئەم حەدیثــە (عــامە) بۆ هەموو زەمانێك لە زەمانی پێغەمبەر (د) خەڵکی بۆ فێربـوونی ئاینی ئیســلام دەچوونە مەدینە. لەزەمانی ئەصحاب و تابعین بۆ ئەوە

دەچوون کەچۆنە ئیسلامەتی وابکەن. لەزەمانی پاش ئەوانیش بۆ زیارەتی قەبری پێغەمبەر (د) دەچن وە بۆ نوێژ کردن لە مزگەوتی پێغەمبەرو دیتنی شوێنەواری ئەو.

# «ئەمەش دوعای مترجیمە (وەرگێڕ)

(اللهُم ارزقني بجاه من اكتب عنه هذه المشاهدة في حياتي وأمِتني على حبِّهِ وحبِّ آلِهِ. واصحابه آمين يا مجيب السائلين.

واتە: خودایە لەبۆ خاتری ئەوەی کەلەسەری دەنووسم ـ کە پێغەمبەرە ـ د ـ ئەم شوێنە ببینم وەبشم مرێنە لەسەر خۆشەویستی پێغەمبەرو خزم و یارانی ئەو.

ئەوی راستی بی جەنابی خوا لێخۆشبوو ـ مەلاحسین شێخ سەعدی ـ لەژیانی خۆی چوو بۆ حەج لە سالی ١٩٦٠ ئەم شوێنانەی دیت.

خودا لێی خۆش بی.

«بلاوکەرەوە»
١٩٩٤/٤/١٩

تکایە کاتی خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە ڕاچاوی ئەم هێمایانەی خوارەوە بکەن.

١ـ ض : رضي الله عنه
٢ـ ص : صلى الله عليه وسلم
٣ـ د : دروودی خوای لە سەربێ
٤ـ (خ.ل) : خوا لێی خۆش بێ
٥ـ (ش) : شەرح
٦ـ (ر.ض) : رضي الله عنه

# شعاع شمس الكرد
# في شرح البخاري الشريف

## المجلد الثالث

تاليف
ملاحسين شيخ سعدى

تم تاليف الكتاب
سنة ١٩٥٢

كتبه واعده للطبع
المحامي
بشير حسين سعدى

ژمارەی سپاردنی لە کتێبخانەی نیشتمانی هەرێمی کوردستان (١٨)ی ساڵی ١٩٩٤ دراوەتی

چاپخانەی رۆشنبیری / هەولێر